# 100 چیرۆک سەبارەت بە ژیانی

# ئیمامی شافیعی



محمد صدیق مەنشاوی

وەرگێرانی
کەیهان مستەفا

له بڵاوكراوه‌كانی خانه‌ی چاپ و په‌خشی ڕێنما

زنجیره ٤١٨



## ناسنامه‌ی كتێب

# سه‌د چیرۆك سه‌باره‌ت به ژیانـــی ئیمامی شافیعی


- نوسینی: محمد صديق مه‌نشاوی
- وه‌رگێڕانی: كه‌یهان مسته‌فا
- نه‌خشه‌سازی‌و به‌رگ: فواد كه‌ولۆسی
- نۆبه‌تی چاپ: چاپی یه‌كه‌م
- ساڵی چاپ: ٢٠١٩
- شوێنی چاپ: چاپخانه‌ی كه‌نج
- تیراژ: ١٠٠٠

ناونیشان:

سلێمانی ـ سابوونكه‌ران ـ نێوان گه‌راجی عوسمانی ته‌مین و شوقه‌كانی ته‌كیه ڕووته .

ژماره‌ی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست

# پێشەکی

## ئیمامی شافیعی لە چەند دێڕێکدا ١٥٠ - ٢٠٤ کۆچی

*هاوەڵانی حەدیس خەوتبون ئیمامی شافیعی بەخەبەری هێنانەوە.

* ئەگەر خەڵکی بەپێی ئەقڵەکانیان کێشانە بکرێن ئەوا شافیعی پێشی هەموان دەکەوێت و گەورەی هەموویانە.

* لەخەویدا تفی پێغەمبەری خواردووە و ئیمامی عەلیش مستیلەکەی خۆی پێداوە.

چرای زانایان، ئەدەیبی فەقیهەکان، فەقیهو شارەزای ئەدیبان، نزیکبوو کە لەڕوی پێکهاتەو ڕەوشتەوە بەتەواوەتی کامڵ ببێت، دڕك و داڵەکانی هەژاری بڕی تاوەکو گەیشتە باخچەی زانست، مێژوو بە پێنوسێك لەنور ژیاننامەکەی نوسییەوە، ئەگەر زیاتر گوێی بۆ حەدیس بگرتایە ئەوا ئوممەتی محمد بێنیاز دەبوون لە فەقیهەکانیتر کە حەدیس بگێڕنەوە، هەردوو دەستی کردبوویەوە بۆ بەخشین، زەردەخەنەی خستە سەر لێوە بێبەش و نەدارەکانەوە...

ئەو دەریای زانست و پێشەوای زمانی عەرەبیە، ناوی محمدی کوڕی ئیدریسی کوڕی عەباسی کوڕی شافیعی هاشمی قورەیشیە، نەسەبەکەی گەیشتووەتەوە

بەپێغەمبەر، بەمەتلەبی ناسراوە، دایکیشی ناوی فاتیمەی کچی عوبەیدواللەی کوڕی حەسەنی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیبە، یەکێك لە چوار ئیمامەکەی ئەهلی سوننەیە، خاوەنی مەزهەبی شافیعیەو شافیعیەتیش دەدرێتە پاڵ ئەمەوە، تاك و هەلکەوتوی سەردەمەکەی خۆی بووە، هەڵکەوتووی ئەوکاتە بووە کە تێیدا ژیاوە، شانازی سەدەی دووەمی کۆچی بووە.

لەساڵی ١٥٠ کۆچیدا لەغەزە لەدایکبووە، دایکی لەوە ترساوە کە نەسەبەکەی لەناوبچێت، هەربۆیە کۆچی کردووە و بردویەتی بۆ شاری مەککە، زۆر منداڵ بووە هێشتا دەستی داری نەگرتووە، بەهەتیوی و بێ باوکی گەورە بووە، قورئانی لەبەر کردووە، دواتر چووە بۆ بیابان و فێری شیعر و زمانی عەرەبی بووە، کە ئەوکات تەمەنی گەیشتووەتە بیست ساڵ.

دەڵێت: ئەمانەم تەنها بۆ هاوکاری خۆم کردووە بۆ ئەوەی بەباشی فێری فیقه ببم.

هەر بەبچوکی (موطأ)ی ئیمامی مالیکی لەبەر کردووە، دواتر چووە بۆلای ئیمام مالیك و بۆی خوێندووەتەوە، ئەویش زۆر سەرسامبووە بە خوێندنەوەکەی و عەرەبیە پاراوەکەی، دواتر چووە بۆلای زانایانی شاری مەککەو مەدینە، لە کانیە زولاڵەکانیان زانستی وەرگرتووە، بە زیرەکی و ئەقڵە پێگەیشتووەکەیەوە توانیویەتی لە هەموو هاوڕێی و هاوتەمەنەکانی زیرەکترو زیاتر بێت، کەسێکی بەخشندەی زمانپاراوی داناو لێهاتوو بووە لە دەرهێنانی ماناکاندا.

وەك مەوسوعەیەك بووە لە زانستە جیاوازەکاندا، وەك نەسەبەکان و زانستی پیاوانی حەدیس و جەرح و تەعدیلی گێڕەرەوەکانی حەدیس و زانستی پزیشکی ئەستێرەناسی، بەڵگەکانی زۆر بەهێز بوون و توانایەکی سەیری هەبووە لە

باوەڕپێهێنان و قەتاعەتپێکردنی بەرامبەرەکانیدا، فەزڵ و ڕێزێکی زیاتری بەسەر زانایان و فەقیهەکاندا هەبووە.

*ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: هەرکەسێك لە ئەهلی حەدیس قەڵەم و مرەکەبی گرتبێت بەدەستیەوە ئەوا شافیعی گەورەیی و منەتێکی بەسەریەوە هەبووە.

* زەعفەرانیش دەڵێت: هاوەڵانی حەدیس خەوتبوون تاوەکوە شافیعی هات و هەموویانی بەخەبەر هێنایەوە.

* ڕەبیعی کوڕی سولەیمانیش دەڵێت: ئەگەر ئەقڵی شافیعی کێشانەبکرێت لەگەڵ نیوەی ئەقڵی خەڵکی سەرزەیدا، ئەوا لەوان زیرەکتر دەبێت، ئەگەر لە هۆزی ئیسرائیلیش بوایە ئەوا هەرخەڵکی پێویستیان پێی دەبوو.

لەووڵاتی میسردا و ڕۆژی پێنج شەممە پاش مەغریب کۆچی دوایی کردووە، لە کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەجەب کە دەکاتە ئێوارەی ڕۆژی هەینی بەخاك سپێردراوە، کاتێك خەڵکی لە ناشتن و بەخاك سپاردنەکەی گەڕانەوە مانگی شەعبانیان بینی، واتە لەساڵی دوسەد و چواری کۆچی لە تەمەنی پەنجاو چوار ساڵیدا مردووە، گۆڕەکەیشی لەو ووڵاتەدا دیارو ناسراوە لەچ شوێنێکدایە.

لەکۆتاییدا خودایا من داوای دڵسۆزیت لێدەکەم لەکاروکردارو گوفتارەکانمدا، خودایا ئەمکارەیشم بکەیتە توێشویەك کە بەڕوویەکی سورەوە بتوانم بگەڕێمەوە بەربارەگای تۆ....

هیوادار بە بەخشندەیی خودای خۆی

محمد صدیق خلیفە مەنشاوی

# شوێنی لەدایکبوون و فێربوونی زانست

لە باخچەی بیرەوەرییەکان و خۆشەویستی ڕابوردودا، ئیمامی شافیعی دانیشت و دەستیکردە گێڕانەوەی شوێنی لەدایکبوون و ژیاننامەی تایبەتی خۆی.

گوتی: لەساڵی سەدو پەنجای کۆچیدا لەشاری غەزە لەدایکبووم، دایکم بردومی بۆ عەسقەلان، ترساوە لەوەی کە نەسەبەکەم لەناو بچێت و کاتێك گەورەبووم نەزانم ئەسڵ و نەسەبم کامەیە.

هەربۆیە دەڵێت: من دەترسم کە نەسەبی خۆت نەزانیت و لەبیرت بچێتەوە.

ئەوەبوو بردومی بۆ شاری مەککە، لەوکاتەدا تەمەنم دە ساڵان بووە، لەوشارەدا چوومە لای مامۆستایەکی پایەبەرزو گەورەو دەستمکردە فێربوونی زانست و زانیاری.

مامۆستا پێی گوتم: خۆت سەرقاڵ مەکە بەم شتانەوە، بەڵکو ڕوبکەرە شتێك کە سودی هەیە بۆت، ئەوەبوو هەموو هیمەت و توانای خۆم لەم زانستەدا (فیقه) خستەگەڕ، ئەوەی کە خودای گەورە ویستی بەباشی و بەجوانی لەوزانستە فێری بووم[١].

---

[١] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ٢٧٢- ٧٤ . سیر اعلام النبلاء ب ١٠ لا ٨٦ .

*ڕۆژێکیان عەمری کوڕی سەواد لەلای ئیمامی شافیعی دادەنیشتێت، شافیعی دەستدەکات بە گێڕانەوەی چمکێك لە ژیان و ژیاننامەی خۆی.

بەوپەڕی ئەدەبەوە دەڵێت: لەعەسقەلان لەدایکبووم (ئەوشارەی کە غەزە لێیە)کاتێك تەمەنم بووە بە دە ساڵان دایکم بردومی بۆ شاری مەککە، دای خستمیە بەر فێربوونی دوو شتەوە تیرهاوێژی و فێربوونی زانست، ئەوەبوو تیرئەندازیەکەدا هێندە توانایم پەیدا کرد لە دە تیردا کە دەمهاویشتن هەردەیان بەجوانی لە نیشانەکە دەدا و دەمپێکان.

بەڵام ئیمامی شافیعی لەبارەی تواناو لێهاتنی زانستی خۆیەوە لەبەر ئەدەب خۆشکێنی بێدەنگبووە و هیچی نەگوتووە.

عەمری کوڕی سەوادیش وەك ویژدان ئەیەوێت لەناو ئەو خۆشکێنیەید دەریبهێنێت و دەڵێت: سوێند بەخودا تۆ لەزانستدا زۆر لە تیرهاوێژی شارەزاو زیرەکتری[٢].

## بلیمەتی و شارەزایی شافیعی و وەرعی مامۆستا

هەر لەمنداڵیەوە و هێشتا دەستەکانی داریان نەگرتبوو، شافیعی لەبەر لێهاتویی و شارەزایی و سەرکەوتنی لە بەدەستهێنانی زانست و خۆشەویستیدا بۆی لە هەموان جیاوازتر بوو.

ئەوەتا خۆی چمکێك لە شارەزایی خۆی لەزانست و سەرکەوتویی لەوبوارەدا بۆمان دەگێڕێتەوە:

کاتێك لەناو نوسەرەکاندا بووم گوێم لە مامۆستا بوو کە ئایەتێکی فێری منداڵێك دەکرد، لەولاوە من یەکسەر ئەو ئایەتەم لەبەر دەکرد، منداڵەکانی شتەکانیان

[٢] حلية الاولياء ب ٩ لا ٧٧، تاريخ بغداد ب ٢ لا ٥٩ – ٦٠ .

دەنوسیەوە، کاتێك مامۆستا لە خوێندنەوەی ئایەتەکان دەبوویەوە و منداڵەکانیش هەموویان دەنوسیەوە، هەرچیەك مامۆستاکە خوێندبوویەوە هەموویم لەبەرکردبوو!!

کاتێك مامۆستا لێهاتویی شافیعی و هێزی لەبەرکردنی بۆ ئایەتەکان دەبینێت، بەوپەڕی وەرعەوە دەڵێت: جوان نیە بۆ من کە هیچ هەڵەیەکت لێبکرم داوی کاغەزی ئایەتەکانت لێبکەم[1].

## هیمەت بەرزی شافیعی لە بەدەستهێنانی زانستدا

بەوپەڕی بەختەوەری و دڵخۆشیەوە شافیعی ئەقڵی خۆی لەناو باخچەی منداڵیدا بەردا بۆ ئەوەی هەموو خۆشیەکان وەربگرێت، هەمیشە باسی ئەو هەژارییەی خۆی دەکرد کە نەبووەتە ڕێگری لەبەدەستهێنانی زانست و زانیاریدا.

بەناو ڕابوردا ڕۆچووە و دەڵێت: من منداڵێکی بێباوکی هەتیو بووم لەکۆشی دایکمدا، بردمیە لای نوسەرەکان، هیچی نەبوو کە وەك کرێ بیدات بە مامۆستاکەم، مامۆستاکەیش بەوە ڕازی بوو کە کاتێك ئەو لەوێ نەبوو نوسەرەکانی بەجێهێشت ئەم لەلایان دابنیشێت.

کاتێك قورئانم خەتم کرد چومە مزگەوتەوە، لەگەڵ زاناکاندا دادەنیشتم، حەدیس و مەسەلەکانم دەبیست و هەمویانم لەبەر دەکرد، دایکم پارەی نەبوو کە بتوانم کاغەزی پێبکرم، منیش پارچە ئێسقان و پێستەم دەهێناو شتم لەسەر دەنوسین، کاتێك پڕم دەکردنەوە دەمخستنە ناو گۆزەیەکی گەورەوە(مەرکانە)، ئەوەبوو پاش

---

[1] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٩٤.

ماوەیەك دوو مەرکانەی گەورە لە ئێسقان و پێستەم کۆکردبویەوە کە شتم لەسەر نوسیبون[٤].

# فێربوونی فیقـه

شافیعی هەر لەمنداڵیەوە فێری شیعرو مێژووی عەرەب و ئەدەب بووە، تاوەکو وایلێهاتووە شارەزاییەکی زۆری لە ئەدەبدا پەیدا کردووە، لە فێربوون و بەدەستهێنانی فیقهیشدا پێشەوا بووە، هۆکاری سەرقاڵی و فێربوونی محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی بۆ فیقه ئەوەبووە کە ڕۆژێکیان بەسواری وولاخەکەی خۆی دەڕوات، لەپشتیەوە عبداللەی زوبێری نوسەر بووە، شافیعیش نمونەی بە بەیتە شیعرێك هێناوەتەوە، عبداللەی زوبێری نوسەریش بە قامچیەك لێیداوە، بەدەنگێکی بەرز پێی گوتووە: کەسانێکی وەك تۆ ئابڕوی ئەم زانستە دەبەن، تۆ لەکوێ و فیقە لەکوێ؟!

ئەم ووشانە ویژدانی شافیعیان هەژاند، کەمێك بەخۆیدا چوویەوە، ئەوەبوو خودای گەورە ڕێنماییکرد بۆ فێربوونی فیقه، ئەوەبوو بەخێرایی ڕۆیشت و لەلای زنجی کوڕی خالیدی موفتی مەککەدا دانیشت و فێری فیقه بوو، دواتریش چوویە لای مالیکی کوڕی ئەنەسی ئیمام و پێشەوای ماڵی کۆچ (شاری مەدینە)[٥].

---

[٤] حلیة الاولیاء ب ٩ لا ٧٣ .

[٥] سیر اعلام النبلاء ب ١٠ لا ٨٥ . الحلیة ب ٩ لا ٧٠ – ٧١ .

# شافیعی و لەبەرکردنی زانست

بە زەردەخەنەیکی ناسکەوە، بەدەموچاوێکەوە کە نیشانەکانی قەناعەت و ڕەزامەندیان لەسەر دەرکەوتبوو، ئیمامی شافیعی لەنێوان قوتابیەکانیدا دانیشت و باسی ئەو میحنەت و ناڕەحەتیانەی بۆ دەکردن کە بەسەریدا هاتوون، هەروەها چۆن و بەچ شێوەیەك زاڵبووە بەسەریاندا و نەیانتوانیوە ببنە بەربەست لەبەردەمیدا و لە بەدەستهێنانی زانست بێبەشی بکەن!

دەڵێت: شازدەساڵ ژیام زۆربەی کاتەکان خواردنم هەویری تازە و نانی ووشك بوو، لەگەڵ کەمێك خورما کە تەنها کەمێکم خواردووە بۆ ئەوەی جەستەم لاواز نەبێت.

پێیانگوت: مەبەستت چی بووە لەوکارە ئەی باوکی عبدالله؟

گوتی: ویستم زانست و فیقه لەبەر بکەم، ئەوەم لەپێناوی خوادا کرد، ئەوەبوو خودایش بە بەخشندەیی و میهرەبانی خۆی ڕۆزی پێبەخشیم[6].

قوتابیەکانی فێری سەبرو خۆراگری دەکرد لەسەر بەدەستهێنانی زانست و دەیگوت: سوێند بەخودا من هێندە هەژارو نەدار بووم کە بە زەحمەت دەمتوانی پارەی کاغەزەکان بدەم[7].

# شافیعی و بەرەکەتی تفی پێغەمبەر(ص)

شەوداهات، تاریکایی هێرشی هێنا، خەو باڵی کێشا بەسەر بونەوەردا، لاوچاکی بچووك محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی چاوەکانی چوونە ناو خەوێکی قوڵەوە.

لەوکاتەی کە ئەو خەوتبوو، پێغەمبەری لە خەونیدا بینی.

---

[6] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٤٠ .

[7] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٤١ .

شافیعی خۆی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لەنێوان خۆی و پێغەمبەردا ڕویداوە و دەڵێت:

پێغەمبەرم لەخەونمدا بینی.

پێی گوتم: کوڕەکە.

منیش گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا.

گوتی: تۆ کێیت؟

منیش گوتم: لە ئوممەتی تۆم.

گوتی: وەرە پێشەوە، منیش لێی نزیکبوومەوە، کەمێک تفی خۆی هێنا و منیش دەمم کردەوە، ئەویش تفەکەی هێنا بەسەر لێوو زمان و دەممدا.

دواتر گوتی: بڕۆ ئافەرین بۆتۆ و خودا بەرەکەتت تێبخات.

لەپاش ئەو خەونەوە، لەبیرم نایەت کە بێجگە لە فیقه سەرقاڵی شیعرو ئەدەب بوبم[٨]!

## شافیعی و ئیمامی مالیك

بەوپەڕی سۆزو خۆشەویستیەوە لاوچاکی تەمەن کەم محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی کەوت بەسەر (موطأ)ی ئیمامی مالیکداو دەستیکردە خوێندنەوەی تاوەکو بەجوانی لەبەری کردو لەدڵ و دەرونیدا چەسپی.

دواتر لە تەمەنی سیازدە ساڵیدا هات بۆلای ئیمامی مالیك.

ئیمامی مالیکیش گوتی: کەسێك بانگبکە بابۆتی بخوێنێتەوە.

---

[٨] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ٩٨ . توالی التأسیس للرازی لا ٥٢.

شافیعیش گوتی: من خۆم دەیخوێنمەوە، ئەگەر خوێندنەوەکەمت بەدڵ نەبوو ئەوا بێدەنگ دەبم و بۆ خۆمی دەخوێنمەوە، ئەوەبوو دەستیکردە خوێندنەوەی کتێبی (موطأ) بۆ ئیمامی مالیك، ئەویش زۆر پێی سەرسام بوو.

شافیعی خۆی دەڵێت: زۆرجار بۆ دڵنیابوونی خۆی پێی دەگوتم: فلانە حەدیس بڵێرەوە، منیش دەمگوتەوە، ئەویش زۆر سەری سوڕ دەما، دواتر لەبارەی مەسەلەیەکەوە پرسیارم لێکرد و وەڵامی دامەوە، دواتر لەبارەی مەسەلەیەکی ترو داتریش لەبارەی مەسەلەیەکی ترەوە پرسیارم لێدەکرد و دواتر مەسەلەیەکی ترو....هتد.

مالیك گوتی: تۆ دەبێت دادوەر بیت[9].

*لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: کاتێك کە شافیعی لەگەڵ والی مەدینەدا هات بۆ لای ئیمامی مالیك ئیمامی مالیك کە فەراسەتی هەبوو پێی گوت: ئەی محمد لەخودا بترسەو لە گوناه دووربکەوە، چوونکە تووشی بارودۆخێکی نالەبارت دەکات.

شافیعیش گوتی: بەڵێ بەوپەڕی ڕێزەوە.

مالیك گوتی: ئەگەر سبەی بێیت و کەسێکیش بێت (موطأ)ت بۆ بخوێنێتەوە، باشترە.

شافیعیش گوتی: من خۆم بەئاشکرا بۆ هەموانی دەخوێنمەوە.

شافیعی خۆی دەڵێت: بۆ بەیانیەکەی چوم بۆلای و دەستمکرد بە خوێندنەوەی موطأ هەرکاتێك کەمێك سامی مالیك دەیگرتم و ئەومویست بوەستم نەیدەهێشت چوونکە زۆر سەرسام بوبو بە جوان خوێندەوە و ئیعرابەکەم.

---

[9] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ١٠١ .

پێی دەگوتم: ئەی گەنجەکە بەردەوامبە، تاوەکو لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا هەموویم بۆ خوێندەوە، دواتر لەشاری مەدینەدا نیشتەجێ بووم و مامەوە تاوەکو مالیکی کوڕی ئەنەس کۆچی دواییکرد[10].

# شافیعی لەبەردەستی مالیکدا

لە کۆڕەکانی ئیمام و پێشەوای ماڵی کۆچدا (شاری مەدینە) مالیکی کوڕی ئەنەس، لاوچاکی منداڵ محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی دانیشت، لە ئەدەب و لە زانستەکەی فێر دەبوو سودی وەردەگرت و شارەزایی پەیدا دەکرد.

پیاوێك هات بۆلای ئیمامی مالیك و بەدەنگێکی پڕ لە ترس و لەرزەوە گوتی: ئەی ئەبوعبدالله من پیاوێکم کە کۆتری قومری دەفرۆشم، ئەمڕۆکە قومریەکم فرۆشتووە، کاتی چێشتەنگاو کڕیارەکە هاتەوە بۆلام.

گوتی: قومریەکەت ناخوێنێت و گمەگم ناکات، بوویە دەمەقاڵێمان تاوەکو من تەلاقێك هات بەسەر زارمدا کە ئەم قومریە بەردەوام دەخوێنێت و لە گمەگم ناوەستێت!

مالیکیش گوتی: تەواو تۆ ژنەکەت تەلاقداوە و ئیتر هیچ ڕێگایەکت بۆ نەماوەتەوە کە ژنی تۆ بێت، پیاوەکەیش بەدڵتەنگی و پەژارەوە ڕۆیشت.

شافیعی کە لەوکاتەدا تەمەنی چواردە ساڵان بوو هەستایەوەو چوویە بەردەمی پیاوەکە.

گوتی: ئادەی دووبارە مەسەلەکەتم بۆ بگێڕەرەوە، ئەویش گێڕایەوە.

شافیعیش گوتی: کامیان زۆرە خوێندەنەکەی یان بێدەنگیەکەی؟

---

[10] سەرچاوەی پێشوو ب ١ لا ١٠٢ .

پیاوەکەیش گوتی: خوێندنەکەی زیاترە، کۆترەکەی دایەوە بەسەر کڕیارەکەدا و بەپیاوە فرۆشیارەکەش کە تەلاقەکەی خستبوو گوتی: بڕۆ ژنەکەت حەلاڵە بۆت و هیچ تەلاقێکت نەکەوتووە!

پاوەکەیش چوبۆلای ئیمامی مالیك و قسەکەی شافیعی بۆ گێڕایەوە.

مالیکیش شافیعی بانگکرد و پێی گوت: کوڕەکە بیستومە کە فتوایەکی جیاوازت لە فتواکەی من دەرکردووە، ئەمەت لەکوێوە هێناوە؟

شافیعیش گوتی: من پرسیارم لەم پیاوە کرد کە کامیان زیاترە واتە کۆترە قومریەکە خوێندنی زۆرە یان بێدەنگیەکەی؟ ئەویش گوتی: خوێندنەکەی زیاترە.

مالیکیش گوتی: باشە چ سودێك لە خوێندن و بێدەنگی ئەو کۆترەدا هەیە؟

شافیعیش گوتی: چوونکە پێغەمبەری خودا بە فاتیمەی کچی قەیسی گوت: ئەبو جەهم دارعاساکەی لەسەرشانی داناگرێت، خۆ پێغەمبەر دەیزانی کە ئەبو جەهم دەخەوێت و دەخوات و پشویش دەدات، ئەمەی وەك مەجاز گوت، لە نەریتی عەرەبیشدا وایە کە لەنێوان دووکاردا کە یەکێکیان زیاتر بێت حوکمی بەردەوامی پێدەدەن، هەربۆیە منیش قسەی پیاوەکەم بەراستزانی کە گوتی زیاتر دەخوێنێت و حوکمی بەردەوامیم پێدا و بەمەیش فتوام دا کە تەلاقەکەی نەکەوتووە، ئیمامی مالیك زۆر سەرسام بوو بە فیقهو شارەزایی ئیمامی شافیعی و هیچی تری نەگوت[11]!!

[11] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ٢٣٨ – ٢٣٩ .

# گەنجی زانـــــا

بەوپەڕی خۆشکێنی و ترسەوە لاوچاکی گەنج محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی دانیشتبوو خەڵکیش دەورەیاندابوو پرسیاریان لێدەکرد، ئەویش لەبەر خۆشکێنی و ئەدەب کەمتر قسەی دەکرد.

موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی پێی گوت: ئەی باوکی عبدالله فتوا بۆ خەڵکی بدە، سوێند بەخودا کاتی ئەوەت هاتووە کە فتوا بدەیت. ئەوکات تەمەنی لە بیست ساڵان کەمتر بوو[١٢].

دەگوترێت کاتێك شافیعی فتوای داوە تەمەنی پازدە ساڵان بووە، شەونوێژی نەفەوتاوە تاوەکو کۆچی دوایی کردووە.

## لاوی فەقیهو شارەزا...

سوفیانی کوڕی عویەینە ئەگەر شتێك لە تەفسیرو فتوای بۆ بهاتبایاتە پێشەوە و پرسیاریان لێبکردایە یەکسەر لایدەکردەوە بەلای ئیمامی شافیعیدا.

دواتر دەیگوت: پرسیار لەم گەنجە بکەن.

ڕۆژێکیان سوفیانی کوڕی عویەینە حەدیسێکی پێغەمبەری دەگێڕایەوە، کاتێك دوو پیاو دایان بەلایدا و صەفیەی ژنیشی لەگەڵدا بوو، گوتی: ئەوە صەفیەیە، دواتر سوفیان لایکردەوە بەلای شافیعیدا و گوتی: فیقی ئەم حەدیسە کامەیە.

محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعیش کە دەریای زانستە بەوپەڕی زیرەکی و بلیمەتیەوە گوتی: ئەگەر خەڵکی پێغەمبەریان تۆمەتبار کردووەو ئەو تۆمەتەیان داوەتە پاڵی و بەوە کافر بوون، بەڵام پێغەمبەر دواتر لەگەڵیاندا بەئەدەبەوە

---

[١٢] تأريخ بغداد ب ٢ لا ٦٤ .

جولاوەتەوە و گوتویەتی: ئەگەر ئێوە بەوشێوەیەن دەی ئەمە و ئەوە بکەن، بەلام گومانی خراپتان پێنابرێت.

سوفیانی کوڕی عویەینەیش کە چاوەکانی ئەبلەق بوبون لەسەرسامیدا گوتی: خودا پاداشتی خێرت بداتەوە هەمیشە ئەو وەلامەمان دەدەیتەوە کە پێمانخۆشە [١٣].

## شافیعی شارەزاترینی خەڵکی حیجازە

بیشری موریسی گەڕایەوە بۆ شاری بەغداد، هاوەڵانی لەدەوری کۆبوونەوە و سەبارەت بە مەککە و خەڵکەکەی پرسیاریان لێدەکرد.

ئەویش بەترسێکەوە گوتی: لەشاری مەککەدا پیاوێکم بینی کە نیوەی ئەقڵی ئەهلی دوونیای هەبوو(واتە محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی).

کاتێکیش شافیعی هاتە شاری بەغدادەوە خەڵکی بەخێرایی چوون بۆلای و سەردانیاندەکرد و پرسیاریان لێدەکرد، یەکێك لەوانەیش بیشری موریسی بوو کە لەسەر مەسەلەیەك مونازەرەی لەگەڵ شافیعیدا کرد.

بیشر پێی گوت: ئەی باوکی عبدالله چاوەڕێم نەدەکرد وابیت بەڕاستی گۆڕدراویت.

شافیعیش پێی گوت: ئەی باوکی عبدالڕەحمان منیش بەمشێوەیە تۆم نەبینیبوو.

کاتێك بیشری موریسی لەلای ئیمامی شافیعی دەرچوو، ڕوویکردە هاوەڵانی و بەوپەڕی سەرسامیەوە گوتی: هیچکەسێك لە ئەهلی حیجازم نەبینیوە کە لەو شارەزاتر بێت [١٤].

---

[١٣] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ٢٤١ – ٢٤٢ .

[١٤] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٢٠١ .

## شافیعی ئیمامی عەلی دەبینێت

خۆرهەڵات و تیشکە زێوینەکانی دایان لەسەر زەوی، شافیعیش بەخێراییەوە چوو بۆلای یەکێك لەوانەی کە خەون لێکدەدەنەوە( خەونزانەکان).

بەخەونزانەکەی گوت: دوێنی لە خەومدا وامزانی لە بازاڕی تەوافدا دانیشتبووم، دەبینم عەلی کوڕی ئەبوتالیب هات بۆلام و منیش لەبەری هەستامەوە و دەستمکردە ملی و ئەویش دەستی کردە ملی من و تەوقەمان لەگەڵ یەکتریدا کرد و مستیلەکەی لەپەنجەی دەرهێناو کردییە پەنجەی منەوە.

پیاوە خەونزانەکەیش گوتی: باوەشکردن و دەستکردنە ملی عەلی (ع) ئەوە ڕزگاریە لە ئاگری دۆزەخ، تەوقەکردنەکەیش: بریتیە لە ئەمان و بێوەیی لە ڕۆژی فەسلاَندا، ئەو مستیلەیەش کە کردویەتیە پەنجەتەوە، ئەگەر بەڕاستی ئەو خەوەت بینیبێت ئەوا ناوی تۆیش هەروەك ناوی عەلی لەهەموو شوێن و ناوچەیەکی ئەم جیهانەدا بلاَو دەبێتە کە ناوی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی تێدا بلاَوبووەتەوە و ناسراوە.

هێندەی نەبرد شافیعی دەستیکردە نوسینی کتێب و ناوی بەهەموو شوێنێکدا بلاَوبوویەوە و ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد[١٥].

## شافیعی و تەرازووەکە...

لە شاری مەککەی پیرۆزدا گەنجی لاوچاك محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی بەشوێن مامۆستایانی زانستدا دەگەڕا، هەمیشە لە کۆڕو مەجلیسەکانیاندا بەشداری دەکرد بۆ ئەوەی ئەقڵ و دڵ و دەرونی لەکانی زولاَلی زانست و زانیاری ئەوان تێرئاو بکات.

[١٥] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ١٤٩ – ١٥٠ .

لەپاش ڕۆژێکی پڕ لە هەوڵ و تێکۆشان و گەڕان، کە شەوداهات شافیعی چاوەکانی چوونە خەوێکی قوڵەوە، بەڵام لەخەونیدا شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەی بینی.

شافیعی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەخەونمدا پیاوێکی بەهەیبەتم بینی کەلەناو کەعبەی پیرۆزدا ئیمامەتی بۆ خەڵکی دەکرد، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد ڕوویکردە خەڵکە و ئامۆژگاری دەکردن و فێری دەکردن.

دەڵێت: منیش نزیکی بوومەوە و پێمگوت: فێرم بکە.

ئەویش تەرازویەکی لە هەگبەکەی دەرهێناو بەدیاری پێی بەخشیم.

گوتی: ئەوە بەدیاری بۆ تۆ.

دواتر شافیعی لە خەو بێدار دەبێتەوە و خەوەکەی بۆ یەکێك لە ڕاڤەکارانی خەو لەشاری مەککەدا دەگێڕێتەوە.

خەونزانەکەیش پێی دەڵێت: تۆ دەگەیت بەزانستێکی زۆرو دەبیتە ئیمام و پێشەوا لە زانست و زانیاریدا، لەسەر ڕێگەی ڕاست و سوننەتی پێغەمبەر دەبیت، چوونکە ئیمامی کەعبەی پیرۆز باشترینی ئیمامەکانە و لەسەروی هەموشیانەوەیە، تەرازووەکەیش، مانای ئەوەیە تۆ بەباشی لە حەقیقەت و ڕاستی هەموو شتەکان بەئەندازەی پێویستی خۆیان تێدەگەیت و شارەزاییت هەیە لەبارەی مەسەلەکانەوە[16].

# شافیعی و قەدرو ڕێزی پێغەمبەر(ص)

لەناو قولاییەکانی ڕابوردودا، زاری خۆی و گوێی دەوروبەرەکانی بە باسکردنی چاکەو گەورەییەکانی پێغەمبەر بۆنخۆش دەکرد.

---

[16] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٩٩.

گوتی: خودا هەرشتێکی بە هەر پێغەمبەرێك دابێت ئەوا زیاتری بە پێغەمبەری ئیسلام داوە.

پێیانگوت: زیندووکردنەوەی مردووەکان دراوە بە عیسای کوڕی مەریەم.

شافیعیش گوتی: شین و گریانی کۆتەرە دارخورماکە لەوە گرنگترە، چوونکە زیندوکردنەوەی دارە مردووەکان گەورەترە لە زیندوکردنەوەی مرۆڤەکان.

پێیانگوت: موسا دەریای بۆ شەق کراوە.

شافیعیش گوتی: لەتکردن و شەق کردنی مانگ لە دەریا گرنگترو گەورەترە.

ئەگەر بلێین خۆ موسا لەبەرد ئاوی هێناوەتە دەرەوە، ئەوا پێغەمبەری ئێمەیش لەنێوان پەنجەکانیدا ئاوی هێناوەتە دەرەوە کە ئەمە سەیرترو گرنگترە، چوونکە هاتنە دەرەوەی ئاو لەناو بەردەلآندا شتێکی ئاساییە بەلآم هاتنە دەرەوەی ئاو لەنێوان پەنجەکان و خوێن و گۆشتتدا گەورەترەو سەرسوڕهێنەر ترە.

ئەگەر بلێین خودا ڕەشەبای خستووەتە ژێر دەستی پێغەمبەر سولەیمانەوە، ئەوا پێغمبەری ئێمەیش بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمانەکان و لەوە گەورەترو گرنگتری بینیوە[17].

## بیشر ئیرەیی بە شافیعی دەبات

بیشری موریسی لەحەجەوە گەڕایەوە بۆ عێراق، هاوڕێیان و هاوەلآنی دەهاتن و سەردانیان دەکرد.

گوتی: لە ناوچەی حیجازدا پیاوێکم بینی کە هیچ پرسیارکەرو وەلآمدەرەوەیەکی وەك ئەوم نەبینیبوو(مەبەستی شافیعی بوو).

[17] مناقب الشافعي للرازي لا ١٢١.

ڕۆژان تێپەڕین و شافیعی هات بۆ عێراق و چوویە شاری بەغدادەوە، خەڵکی بەدەوری کۆبونەوە و زۆر سەرسام بوون بەزانست و زانیارییەکانی، تاوەکو وایلێهات کە وانەکانی بیشریان بەجێهێشت و دەهاتن و لەکۆڕو وانەکانی شافیعیدا دادەنیشتن.

ڕۆژێکیان پیاوێك لە هاوڕێیانی بیشر کە ناوی حەسەنی زەعفەرانی بوو هات بۆلای.

گوتی: ئەو شافیعیەی کە تۆ باست دەکرد هاتووە بۆ ئێرە، دەستیکردە مەدح و سەناو پیاهەڵدان بە زانست و زانیاری و شارەزاییەکەیدا.

بیشریش بە ئیرەییەکەوە بەرامبەر بە شافیعی گوتی: زۆر گۆڕاوە و وەك پێشتر نەماوە.

زەعفەرانی دەڵێت: بیشریش هەروەك جوولەکەکانی لێهات بەرامبەر بە شافیعی، کاتێك گوتیان: عبداللەی کوڕی سەلول چیتانە؟ گوتیان: گەورەمان و کوڕی گەورەترین پیاومانە! بەڵام کاتێك گوتیان: دەنگوباسێك هەیە کە دەڵێن موسوڵمان بووە، یەکسەر گوتیان خراپترین پیاوو کوڕی پیاوخراپترین کەسمانە! واتە بیشریش ئەگەر باسی شافیعی لەلادا بکرێت و مەدح و سەنای نەکرێت ئەویش وەسفی دەکات، بەڵام کاتێك بەشانوباڵی شافیعیدا هەڵبدرێت ئەوا یەکسەر دەڵێت بەوشێوەیەش نیەو گۆڕدراوە[١٨]!!

[١٨] تاريخ بغداد ب ٢ لا ٦٥.

# ئیمامی ئەحمەد جلەوی وولاخەکەی شافیعی دەگرێت...

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نەخۆش کەوت و کەوتە سەرجێگە، شەیخی گەورەی خۆی ئیمامی شافیعی هات بۆ سەردانی، ئیمام ئەحمەد لەسەر جێگەکەی ڕاکشابوو یەکسەر هەستایەوە، ئیمامی شافیعیش چەمایەوە و نێوچاوانی ماچکرد، دواتر ئیمام ئەحەمەد وەك ڕێزێك لەجێگەکەی خۆیدا دایناو خۆی لەبەردەمیدا دانیشت، دەستیکردە پرسیارکردن لەبارەی مەسەلەکانی ڕۆژو سەردەمەوە.

کاتێك ئیمامی شافیعی هەستایەوە و ڕۆیشت و سواری وولاخەکەی بوو، ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەئەدەبێکەوە چوویە پێشەوە و جلەوی وولاخەکەی ئیمامی شافیعی گرت و بۆ ماوەیەك لەگەڵیدا ڕۆیشت و خوداحافیزی لێکرد.

ئەمە گەیشتەوە بە یەحیای کوڕی موعین و بە ئیمامی ئەحمەدی گوت: پاکوبێگەردی بۆ خودا وات لێهاتووە کە جلەوی وولاخەکەی شافیعی بگریت و لەگەڵیدا بڕۆیت؟!

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش گوتی: سوێند بەخودا ئەگەر تۆیش لەولاکەی تری وولاخەکەی شافیعیەوە بڕۆیشتیتایە ئەوا بەدڵنیاییەوە سودت لە زانست و فیقهەکەی وەردەگرت[19]!

[19] حلیة الاولیاء ب ۹ لا ۹۹.

# شافیعی و پەروەردەکاری منداڵەکانی ڕەشید

ڕۆژێکیان شافیعی هات بۆلای ئەمیری ئیمانداران هارونە ڕەشید، بۆ ئەوەی مۆڵەتی بدات و بچێتە ژوورەوە بۆلای.

خزمەتکارەکەی خەلیفە هاوڕێیەتی شافیعی کرد تاوەکو بردیە لای ئەبی عبدالصمدی پەروەردەکارو مامۆستای منداڵەکانی خەلیفە هارونە ڕەشید.

خزمەتکارەکە بە شافیعی گوت: ئەی باوکی عبدالله ئەمانە منداڵەکانی ئەمیری ئیماندارانن و ئەوەیش مامۆستاو پەروەردەکارەکەیانە، بۆچی سەبارەت بە منداڵەکانی خەلیفە ئامۆژگاری ناکەیت.

شافیعیش ڕوویکردە ئەبی عبد الصمدو بەدەنگێکی تەڕو پاراوی زۆر نەرم و نیانەوە گوتی: پێش ئەوەی پەروەردەی منداڵەکانی ئەمیری ئیمانداران بکەیت پێویستە خۆت بەباشی پەروەردە بکەیت و خۆت چاکبکەیت، چوونکە چاوی ئەوان بەستراوەتەوە بە چاوەکانی تۆوە، بەلای ئەوانەوە شتی چاك و باش ئەوەیە کە تۆ بەباشی دەزانیت، خراپەیش لەلای ئەوان ئەوەیە کە تۆ بەخراپی دەزانیت و وازی لێدەهێنیت، فێری کتێبەکەی خودایان بکە، بەزۆر فێریان مەکە تاوەکو لێی بێزار بن، هێندەی پشتگوێیان مەخە کە بەتەواوەتی وازی لێبهێنن، پاکترین و باشترینی شیعرەکان و بەڕێزترینی قسەو حەدیسەکانیان فێر بکە، لەزانستێکەوە مەیانبەرە سەر زانستێکیتر تاوەکو بەباشی فێری دەبن، چوونکە زۆری و قەرەباڵغی زانست و قسەو باسەکان لەناو مێشك و بیری مرۆڤدا دەبێتە هۆی سەرگەردانی لە تێگەیشتندا[٢٠].

[٢٠] الحلیة ب ٩ لا ١٤٩ .

# شافیعی و حومەیدی

ڕۆژێکیان حومەیدی هات بۆلای ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

بە بێزاریەوە گوتی: ئەی باوکی عبدالله لەگەڵ شافیعیدا دادەنیشیت؟

ئیمامی ئەحمەدیش گوتی: باشە بۆچی لەگەڵیدا دانەنیشم؟ تۆ لەگەڵی دانیشتویت؟

حومەیدی گوتی: نەخێر.

ئیمامی ئەحمەدیش گوتی: بڕۆ لەگەڵیدا دابنیشە، تاوەکو کاتێك قسە دەکەیت بزانیت چی دەڵێیت، ئەوەبوو حومەیدیش چوو بۆناو کۆڕو مەجلیسەکەی شافیعی و قسە خۆش و پاراوەکانی و زانستە بێوێنەکەی بیست، بەخێراییەوە گەڕایەوە بۆلای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

بەداخ و پەژارەیەکەوە گوتی: ئەی باوکی عبدالله لەبارەی ئەم پیاوەوە زۆر زیادەڕەویم کرد[٢١].

# شافیعی ماڵێك بۆ هاوڕێکانی دەکڕێت

شافیعی خۆی ئامادە کرد و کۆڵ و باری پێچایەوە بۆ ئەوەی شاری مەککە بەجێبهێڵێت، هەندێك پارەی پێبوو.

ئەبو سەوری هاوڕێی پێی گوت: پێویستە بەم پارەیە شتێك بکڕیت بۆ ئەوەی لەپاش خۆت بۆ کوڕەکەت بەجێ بمێنێت.

ئەوەبوو شافیعی پارەکەی لەگەڵ خۆیدا بردو پاش کەمێك گەڕایەوە و پارەکەی پێ نەمابوو.

---

[٢١] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ١٥٥ .

پرسیاری لێکرد کە پارەکەی چی لێکردووە؟

بەدەنگێکی سوپاسگوزارانەوە گوتی: شتێکم لەمەککەدا نەبینی کە بیکرم، بەلام لەشاری مەککەدا ماڵێکم بنیاتنا کە هاوەڵانمان دەتوانن تێیدا بمێننەوە بەتایبەت ئەوکاتانەی کە دێن بۆ شاری مەککە بۆ حەجکردن[٢٢].

## شافیعی و هوتاف کێشەکە....

جەژن هاتە پێشەوە و خۆشی و شادومانی هەموو شوێنێکی گرتەوە، شافیعیش نە دینارو نە دیرهەمێکی نەبوو کە خەرجی بکات بۆ ماڵ و منداڵەکەی و هەندێك لە کەسە نەدارو ئاتاجەکان.

خێزانەکەی پێی گوت: برۆ بۆلای ئەوانەی کە پەیوەندیت پێیانەوە هەیە بەڵکو شتێك دەستبکەوێت؟

ئەوەبوو شافیعیش حەفتا دیناری وەك سولفە هێنا، بیست دیناری دانا بۆ خەرجی ماڵەوە و ئەویتریشی بەخشیەوە.

لەوکاتەدا شافیعی سەرقاڵی ئەوەبوو پیاوێکی قورەیشی هات بۆلای و داوای یارمەتی لێکرد.

شافیعیش پێی گوت: هەرچیەکت دەوێت هەڵیبگرە.

پیاوەکەیش گوتی: پێویستی من لەم دینارانە زیاتر نیە.

شافیعیش وەك عاشقێکی خێرو چاکەکردن بە پیاوەکەی گوت: هەڵیانبگرە بۆ خۆت.

پیاوەکەیش دینارەکانی برد، شافیعیش هیچی لەدەستدا نەمایەوە، نە دینارو نە دیرهەمیش.

---

[٢٢] حلية الاولياء ب ٩ لا ١٢٧ .

شافیعی دەڵێت: لەوکاتەی من لەماڵەوە بووم نێردراوێکی برەمکی جەعفەری کوڕی یەحیا هات بۆلام و گوتی: وەڵامم بدەرەوە، منیش وەڵامم دایەوە.

گوتی: ئەمشەو دەنگوباست چۆنە؟ گوێم لێبوو هوتافکێشێك هاواری دەکرد: شافیعی....شافیعی...هەرکاتێك چاوت چوویە خەو لە خەوەکەتدا باسی حاڵی خۆتم بۆ بکە.

منیش باسی خۆمم بۆکرد، ئەویش پێنج سەد دیناری پێدام.

گوتی: بۆتی زیاد بکەم، ئەوەبوو پێنج سەدی تری پێدام، هەر بۆی زیاد دەکردم تاوەکو گەیشتە دوو هەزار دینار[٢٣].

## شافیعی فەقیهو شارەزاترینی خەڵکییە...

بەدەنگێکی لە هەورەبروسکە توندتر دەنگی هەراو هۆریا لەدەوری کەعبە بڵاو بوویەوە و نوور و ڕووناکیان بەناو هەموو مەککەدا بڵاو دەکردەوە، لەنێوان زیارەتکارانی کەعبەیشدا فەزڵی بەزاز و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەبوون.

فەزڵ خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵدا حەجمان کرد و لەیەك شوێنداماینەوە، ئەبو عبدالله ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەیانی زوو لەخەو هەستا، منیش بەشوێنیدا ڕۆیشتم.

کاتێك نوێژی بەیانیمان کرد بەناو هەموو ئەڵقەو مەجلیسی دەرسەکاندا دەگەڕام بۆ ئەوەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بدۆزمەوە، تاوەکو گەیشتم بە مەجلیسەکەی سوفیانی کوڕی عویەینە، دەبینم لەلای گەنجێکی عەرەبی دەشتەکی (واتە شافیعی) دانیشتووە، جلوبەرگێکی بۆیاخکراوی لەبەردا بوو، منیش چوومە ناو مەجلیسەکەوە و تاوەکو لەتەنیش ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە دانیشتم.

---

[٢٣] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ٢٣٠ .

گوتم: ئەی باوکی عبدالله ئەبو عویەینەت بەجێهێشتووە کە زوهری و عەمری کوڕی دینارو زیادی کوڕی عەلاقە و چەندین تابیعی تر کە خودا خۆی زانایە لەبارەیانەوە لەلای دانیشتوون؟!

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش بەدەنگێکی پڕ لە سۆزو خۆشەویستیەوە گوتی: بێدەنگبە ئەگەر لەکەسێکی پایە بەرزەوە حەدیسێکت لەدەست دەربچێت ئەوا دەتوانیت لە کەسێکەوە کە لەزانستدا پلە نزمترە بەدەستی بهێنت، ئەوەش هیچ زیانێك لە دین و زانست و فیقهو شارەزاییت نادات، بەلام من لەوە دەترسم کە ئەقڵی ئەم گەنجەم لەدەست دەربچێت و دڵنیام لەوەی کە تاوەکو ڕۆژی قیامەت ئەقڵێکی لەوجۆرەم دەستناکەوێتەوە. چوونکە هیچکەسێکم نەبینیوە کە لە کتێبەکەی خوادا شارەزاتر بێت لەم گەنجە قورەیشیە!

بەزازیش بە سەرسوڕمانەوە گوتی: ئەوە کێیە؟!

ئەحمەدیش بە دوولێوی پێکەنین و دڵێکی زۆر بەختەوەرەوە گوتی: محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعیە ڕەحمەتی خودای لێبێت[٢٤].

## متمانەی شافیعی بە خودای خۆی...

شافیعی بڕیاریدا بڕوات بەرەو میسر، پێش جەستەی دڵی بەرەو ئەوێ دایلە شەقەی باڵ و فڕی، عبداللەی کوڕی حەکەمی هاوڕێی پێی گوت: ئەگەر بڕیارتداوە کە لەو وولاتە (میسر) بمێنیتەوە با خۆراکی ساڵێکت هەبێت، لەگەڵ هاونشینی سوڵتاندا کە شانازی پێوە بکەیت.

شافیعیش بەوپەڕی متمانە بەخودای خۆیەوە گوتی: ئەی باوکی محمد هەرکەسێك تەقوا سەربەرزی نەکات هەرگیز سەربەرز نابێت، من لە شاری غەزە

[٢٤] حلية الاولياء ب ٩ لا ٩٨ – ٩٩..

لەدایکبووم، لە حیجازیش پێگەیشتووم، خۆراکی شەویشمان نەبووە و بە برستیەتیش نەخەوتوین[٢٥]!!

## مامۆستای گشتگیر...

شافیعی لەنێو ئەو قوتابیانەیدا دانیشت کە هاتبون بۆ ئەوەی لە شەیخەکەیانەوە زانست و زانیاری و ئەدەب و ڕەوشت فێر ببن.

شافیعی لەوکاتەی کە ئەدەبی خواردنی فێر دەکردن گوتی: لە خواردندا چوار شت هەیە: چوار فەرز، چوار سوننەت، چوار ئەدەب.

فەرزەکان: شۆردنی هەردوو دەست، قاپەکان، چەقۆ، کەوچك.

سوننەتەکانیش: دانیشتن لەسەر قاچی چەپ، پاروی بچوك، زۆر جوێنی خۆراك، لێسانەوەی پەنجەکان.

چوار ئەدەبەکەیش: نابێت پێش گەورەتر دەست بۆ خواردنەکە ببەیت، دەبێت لەبەردەمی خۆتەوە بخۆیت، کەمتر سەیری دانیشتوانی سەر سفرەکە بکەیت، کەمترین قسەیش بکەیت[٢٦].

## شافیعی و سوالکەرەکە...

شافیعی کاتێك مرۆڤێك داوای لێبکردایە کە شتێکی پێبدات لەبەر خەجاڵەت و تەریقبوونەوە لەکابرای سوالکەر ڕەنگی سور دەبوویەوەو یەکسەر هەرچیەکی دەویست پێی دەبەخشی.

---

[٢٥] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٦٦ .

[٢٦] طبقات الشافعیة للسبکی ب ٢ لا ١٣٥ .

ڕۆژێکیان لەوکاتەدا کە شافیعی بەسورای وولاخەکەیەوە دەڕۆیشت، سوالکەرێك هات و داوای شتێکی لێکرد، ئەویش لەشەرماندا ڕەنگی دەموچاوی گۆڕدرا، جەستەی کەوتە لەرزین و ڕوویکردە سوالکەرەکە.

بەوپەڕی خەجالەتی و داوای لێبوردنەوە پێی گوت: تۆ لەکوێیت تاوەکو پێویستیەکەت بۆ بنێرم.

سوالکەرەکەیش ناوونیشانی شوێنەکەی خۆی پێدا، کاتێك شافیعی گەڕایەوە بۆماڵی خۆیان کابرای سوالکەر هەرچیەکی داواکردبوو دەستبەجێ بۆی نارد[٢٧].

## زمانپاراوی شافیعی...

ڕۆژێکیان ڕەبیعی کوڕی سولەیمان چوو بۆلای ئیمامی شافیعی، لەبەر ئەوەی کەمێك نەخۆش بوو.

ڕەبیع گوتی: ئێستە چۆنی؟

شافیعیش گوتی: زۆر لاواز بووم.

ڕەبیعیش گوتی: خودا شیفات بدات و لاوازیەکەت بگۆڕێت بە هێز.

شافیعی گوتی: ئەی ڕەبیع خودا وەلامی دڵت بداتەوە نەك زمانت، ئەگەر لاوازیەکەم هێزو توانا پەیدا بکات بەسەرمدا دەمکوژێت، بەلام بڵێ خودا زاڵ و بەهێزت بکات بەسەر لاوازیەکەتدا.

ڕەبیعیش بە پۆزشێکەوە گوتی: تەنها مەبەستم خێر بوو.

شافیعیش گوتی: دەزانم، کوڕم سوێند بەخودا ئەگەر بە ڕاشکاوانەیش جنێوم پێبدەیت وەلامت نادەمەوە و زویر نابم چوونکە دڵنیام کە مەبەستت خێرو چاکەیە[٢٨].

---

[٢٧] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ٢٣٥ .

# گفتوگۆی پیاوە گەورەکان...

لەناو گۆڕەپانی خۆشەویستیدا قوتابی نەجیب ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەلای هاوڕێ و شەیخی خۆی ئمامی شافیعیدا دانیشت.

شافیعی بەنەرم و نیانیەوە گوتی: ئایا تۆ پێتوایە کە ئەو کەسەی واز لە نوێژ بهێنێت و تەرکی بکات کافرە؟

ئەحمەدیش گوتی: بەڵێ.

شافیعیش گوتی: ئەگەر ئەو کەسەی وازی لەنوێژ هێناوە کافر بێت بەجۆرێك کە لە ئاین دەری بکات، ئەی بەچی موسوڵمان دەبێت؟

ئەحمەدیش گوتی: دەڵێت لا اله الله محمد رسول الله(ص).

شافیعیش دەڵێت: ئەم پیاوە بە شێوەیەکی هەمیشەیی لەسەر ئەم شایەتمانە ڕاهاتووە و نوێژیش ناکات و بەردەوام ئەم ڕستەیەش لەسەر زمانیەتی.

ئەحمەدیش گوتی: بە نوێژ دووبارە دێتەوە ناو ئاینی ئیسلامی پیرۆز.

شافیعیش گوتی: نوێژی مرۆڤی کافر دروست نیە و حوکمی ئیسلامیشی پێناکرێت.

ئیمامی ئەحمەدیش بێدەنگبوو لەوە تێکەیشت کە کافری مرۆڤی نوێژ نەکەر کافرییەکە کە لەناو ئاینی ئیسلام نایباتە دەرەوە[29].

[28] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ٢١٧ . حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٢٠ .

[29] طبقات الشافعیة للسبکی ب ٢ لا ٦١ .

## شافیعی باشترین کەسی سەردەمی خۆی بووە...

بە هەناسەیەکی درێژەوە کە ماندوبون ناناسێت، شافیعی بەشوێن وانەکانی زانستدا دەگەڕا، دەچوو بۆ کۆڕو مەجلیسی ئیمامی بەڕێزو پایە بەرز سوفیانی کوڕی عویەینە و حەدیسی پێغەمبەری خودای لێوە وەردەگرت بۆ ئەوەی تێنویەتیەکەی بۆ فەرمودە بشکێنێت.

ڕۆژێکیان شافیعی دانیشتبوو دڵ و دەرونی بە حەدیسەکانی فێنك دەکردەوە، سوفیانی کوڕی عویەینەیش هەندێك حەدیسی ڕەقائیقی دەخوێندەوە، کاتێك حەدیسەکان بەرگوێی شافیعی کەوتن، دەستیکردە گریان و هێندە گریا تاوەکو لەهۆشی خۆی چوو ئاگای لەخۆی نەما.

خەڵکی گوتیا: محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی مرد.

سوفیانیش بەداخ و پەژارەیەکی زۆرەوە گوتی: ئەگەر محمدی کوڕی ئیدریس مردبێت، ئەوا دەبێت بڵێین باشترین کەسی سەردەمەکەی خۆی مردووە[٣٠]!!

## شافیعی و دینارەکان...

بەدەستێکی بەخشندەی سەخاوتمەندەوە، هەمیشە زەردەخەنەی دەخستە سەر لێوە برسیە مەحروم و بێبەشەکانەوە.

ئیمامی شافیعی لە شاری صەنعای یەمەنەوە دەرچوو بۆ ئەوەی بەرەو شاری مەککەی پیرۆز بڕوات، لەناو دەستماڵێکدا دەهەزار دیناری پێبوو، لەشوێنێکی دەرەوەی شاری مەککەدا چادری هەڵدا، دەستیکردە بەخشینەوەی دینارەکان بەسەر ئەو کەسانەی کە هەژارو نەدارو ڕێبوارو قوتابی زانست بوون، خەڵکی

---

[٣٠] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ١٧٥ .

دەهاتن بۆلای و هەرچەندیان بویستایە هەڵیاندەگرت، لەشوێنەکەی خۆی نەجوڵا تاوەکو هەموو دینارو پارەکانی خۆی بەخشیەوە[٣١] !

## شافیعی زۆر ڕقی لە داوای لێبوردن بووە...

بە پێیانێك کە حەزیان دەکرد بەرەو خێرو چاکە بچن، پیاوێك هات بۆلای محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی، پێی گوت: فلآنە هاوڕێت نەخۆشە.

شافیعیش بە سوپاسگوزارییەوە گوتی: دەستت خۆش بێت و پیاوەتی خۆتت کرد، چاکەیشت لەگەڵ مندا کرد کە ئاگادارت کردمەوە بۆ ئەوەی ئەو چاکەیە بکەم، ڕێنیشاندەرم بویت بۆ چاکەکارییەکان، هەروەها رزگارت کردم لەوەی کە نەزانم بە نەخۆشیەکەی و نەچم بۆلای و دواتر داوای لێبوردنی لێبکەم کە هەندێك درۆیشی تێکەڵ ببێت.

دواتر داوای لە خزمەتکارەکەی کرد کە نەعلەکانی بۆ بهێنێت.

لەپاشان بە شێوەیەکی ئامۆژگارییەوە گوتی: ڕۆیشتن بە پێخاوسی لەگەرمای هاویندا بۆ ناوچەی زی توا ئاسانترە لە پۆزش هێنانەوە بۆ هاوڕێیەك کە لەوانەیە لەدڵەوە پۆزشەکەی تۆی قبوڵ نەبێت، کە دەکرێت هەندێك لە درۆیشی تێکەڵ ببێت، ئەگەرچی کەمیش بێت.

دواتر گوتی:

*بڕۆم بۆ شوێنێکی دوور بۆ سەردانی نەخۆشێك*

*ئەدەبە ئەوەیشی کە مافەکان جێبەجێ دەکات گورجوگۆڵە*

*ئەوەم بەلاوە باشترە لەو قسەیەی کە دواتر*

*وەك پۆزش بیهێنمەوە و لەپاش خۆم کابرا پێم بڵێت درودەکات*[٣٢]

---

[٣١] حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٣٠ . مناقب الشافعی للرازی لا ١٢٨.

## شـافـیعـی زۆر نـەرم و نیانی خـۆشـویسـتووە...

دەنگی شافیعی زۆر نەرم و نیان و بەسۆزو میهرەبان بووە، بەدەنگە گەرمەکەیەوە توانیویەتی کە دڵی خێزانەکەی و دەوروبەرەکانی بۆلای خۆی ڕابکێشێت.

محمدی کوڕی محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی دەڵێت: محمدی کوڕی ئیدریس بینیمی کە لە هەندێك کاروباردا پەلە دەکەم، (لەمکاتەدا باوك ویستویەتی کە کوڕەکەی ڕێنمایی بکات بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و دروست).

شافیعی کە ئەویست کوڕەکەی پەروەردە بکات گوتی: کوڕی شیرینم بە نەرم و نیانی... بە نەرم و نیانی... چوونکە پەلەکردن کارەکان کەموکورت دەکات و فریایان ناکەویت و بەدەستیان ناهێنێت، بەڵام بە نەرم و نیانیەوە فریای هەموو کارەکانت دەکەویت و بەجوانیش جێبەجێیان دەکەیت و بە هیواو ئاواتەکانت دەگەیت[٣٣].

## شـافیعـی سـەرەخـۆشـی لـە عـبدالرەحـمانی کـوڕی مـەهـدی دەکـات...

یەکێك لە مندالەکانی عبدالرەحمانی کوڕی مەهدی مرد، ئەویش زۆر دڵتەنگ و نارەحەت بوو، شافیعیش نامەیەکی بۆ نوسیو تێیدا هاتبوو:

---

[٣٢] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٠٣ .

[٣٣] مناقب الشافعی للرازی لا ١٢٢ . مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٨٩ .

براکەم سەرەخۆشی لەخۆت بکە بەوشێوەیەی کە تۆ سەرەخۆشی لەخەڵکی دەکەیت، ئەو شتانەیشت پێناخۆش و ناشیرین بێت کە لە خەڵکیدا پێتناخۆش و ناشیرینن، ئەوەش بزانە کە سەختترینی بەڵاو موسیبەتەکان لەدەستدان و نەمانی دڵخۆشی شادومانی و بێبەشیە لە ئەجرو پاداشتی ئیلاهی، ئیتر چۆن ئەم دوانە لەگەڵ بەدەستهێنانی خراپەدا کۆ دەبنەوە؟!

براکەم ئەگەر هاتو خۆشیەکانت لێ نزیکبونەوە بەشی خۆتیان لێ هەڵبگرە پێش ئەوەی کە لێت دوور بکەونەوە، خودا سەبرو خۆڕاگریت لەکاتی بەڵاو موسیبەتەکانتدا پێ ببەخشێت، سەبرو پاداشتی بەخێری ئیمەیش و تۆیش بداتەوە.

دواتر ئەم شیعرەی بۆنوسی:

*من سەرەخۆشیت لێدەکەم هەرچەندە متمانەی تەواوم هەیە*

*کە مرۆڤ نامرێت، بەڵام ئەمە نەریتی ئاینە*

*چوونکە نە سەرەخۆشیکار لەپاش مردووەکە دەمێنێتەوەو*

*نە سەرەخۆشی لێکراویش بە هەتا هەتایی دەمێنێتەوە*[٣٤]

## وەسیەتی پێغەمبەر (ص) بۆ شافیعی...

شافیعی چوو بۆ وولاتی میسرو ڕەبیعی کوڕی سولەیمانی لەگەڵدا بوو، کاتێك لەشوێنی خۆیان نیشتەجێ بوون نامەیەکی نوسی.

گوتی: ئەی ڕەبیع ئەم نامەیەی من بەرەو برۆ بۆلای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و چاوەڕێ بکە تاوەکو وەڵامت دەداتەوە و بۆم بهێنەرەوە.

[٣٤] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ٩٠ – ٩١ .

ڕەبیعیش نامەی برد و بردیە ناو شاری بەغدادەوەو لەکاتی نوێژی بەیانیدا دایە دەستی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوەو گوتی: ئەمە نامەی شافیعی براتە لە میسرەوە بۆم هێناویت.

ئەحمەد گوتی: سەیرت کردووە؟

ڕەبیعیش گوتی: نەخێر...

ئەحمەدیش نامەکەی خوێندەوەو چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك.

ڕەبیع گوتی: چی تێدا نوسراوە؟

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش گوتی: شافیعی ئەوەی بۆ باسکردووم کە لەخەویدا پێغەمبەری بینیوە.

هەروەها فەرمویەتی: نامەیەك بنوسە بۆ باوکی عبدالله ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و سلاوی منی پێبگەینەو پێی بڵێ: تۆ توشی تاقیکردنەوەیەکی گەورە دەبیت و پێت دەڵێن کە دەبێت دانبنێیت بەوەی کە قورئان مەخلوقە، بەلام تۆ دانیپێدا مەنێ دڵنیابە کە خودای گەورە تاوەکو ڕۆژی قیامەت ناوت بەبەرزی و بڵندی دەهێڵێتەوە[٣٥].

## شافیعی دەریای زانستە...

لە مزگەوتی خیف لە مینا شافیعی و محمدی کوڕی حەسەن و ئەزەرەقی فەقیهی مەککە و بیشری موریسی کۆ بوونەوە.

محمدی کوڕی حەسەن بەشافیعی گوت: بیستومە کە تۆ کتێبێکت لەسەر هاوڕێنمان نوسیوە، ئێمەیش حەزدەکەین لەسەر ئەو کتێبە مونازەرەت لەگەڵدا بکەین.

---

[٣٥] مناقب الشافعی للرازی لا ٣٢٤ .

شافیعیش بە ئەدەب و خۆشەویستیەوە گوتی: من ئەوە ناکەم، چوونکە مونازەرە لە دڵ و دەروندا خەوش دروستدەکات، تۆیش هاوڕێی منیت.

محمدی کوڕی حەسەن سور بوو لەسەر مونازەرە لەگەڵ شافیعیدا، ئەوەبوو شافیعیش مونازەرەی لەگەڵدا کردوو لە زۆرێك لە مەسەلەکاندا زاڵبوو بەسەریداو بۆڕیدا.

ئەزرەقی فەقیهی مەککە هاتە پیشەوە بۆ لای بیشری موریسی و بەدەنگێکی کزو لاوازەوە گوتی: هاوڕێکەمان (شافیعی)و هاوڕێکەتان (محمدی کوڕی حەسەن)ت چۆن هاتنە بەرچاو؟

بیشریش گوتی: هاوڕێکەی ئێوە(شافیعی)م وەك دەریایەك لە زانست بینی، بەڵام هاوڕێکەی خۆمان بە دەریایەکی کەم ئاو هاتە بەرچاو.

کاتێك بیشر لە حەجەوە گەڕایەوە بۆ شاری بەغداد پێیانگوت: لە شاری مەککەدا کێت بینی؟

بە ترس و دڵەڕاوکێیەکەوە گوتی: پیاوێکم بینی کە ئەگەر لەئێوە بێت کەستان ناتوانن زاڵبن بەسەریدا، ئەگەریش لەدژتان بێت ئەوا بەباشی خۆتانی بۆ ئامادە بکەن و وریای خۆتان بن، ئەویش محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعیە[٣٦].

## شـافیعـی و پیاوە سـوێنـد خـۆرەکـە....

ڕۆژێکیان کاتێك لەناو هاوەڵانیدا دانیشتبوو، پیاوێك هات بۆلای ئیمامی شافیعی.

بەدەنگێکی پڕ ترسەوە گوتی: ئەی زانا، چی دەڵێیت لەبارەی کەسێکەوە کە سوێنی خواردووە: ئەگەر لە گیرفانەکەمدا یەك دیرهەم لە سێ دیرهەم زیاتر هەبێت ئەوا عەبدەکەم ئازادە، لە گیرفانەکەیشیدا چوار دیرهەم هەبوو؟!

[٣٦] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ٢٠٠.

شافیعیش گوتی: عەبدەکەی ئازادا ناکات، پیاوەکەیش گوتی: بۆچی؟

شافیعیش گوتی: چوونکە یەك دیرهەمی لە دیرهەمەکان جیاکردبوویەوە، یەك دیرهەمیش نابێتە کۆمەڵێك دیرهەم.

پیاوەکەیش بەسەرسامیەوە گوتی: ئیمانم بەو کەسە هێنا کە ئەم زانستەی پێبەخشیت [٣٧].

## بۆچی خودا مێشی دروستکردووە؟

بە هەیبەتی زانایانەوە ئیمامی شافیعی بەو پەڕی ویقارو هێمنیەوە لەلای خەلیفە مەئمون دانیشت.

مەئمون گوتی: ئەی محمد بۆچی خودا مێشی دروستکردووە؟

شافیعیش کەمێك وەستاو دواتر گوتی: وەك سەرشۆڕیەکە بۆ پاشاکانی ئەی ئەمیری ئیمانداران.

مەئمون پێکەنی و گوتی: ئەی محمد مێشکەت بینی کە بەسەر کوڵمی منەوە نیشتەوە؟

ئەویش گوتی: بەڵێ ئەی ئەمیری ئیمانداران!! تۆ پرسیارت لێکردم و منیش هەر ئەو وەڵامەم لەلا هەبوو، ترسێك دایگرتم، کاتێك مێشەکەم بینی لەسەر کوڵمی تۆ نیشتەوە کە شوێنێکە مێروەکانی بەئاسانی ئازاری پاشاکان دەدەن و دە هەزار شمشێر پێی ناگات و دە هەزار ڕمیش نایگاتێ، چوونکە بەدەموچاوی تۆوە بوو، واتە سوپا و هێزو دەسەڵات هیچ ڕۆڵێکیان نیە، دیارە کە پاشاکانیش بێزارو ناڕەحەت دەکەن و ناتوانن هیچ فەرمانێکی سەربازی بۆ کوشتن و گرتنیان دەربکەن، هەربۆیە منیش ئەو وەڵامەم بەسەرزاردا هات.

[٣٧] مناقب الشافعی للرازی لا ٧٩ .

مەئمونی کە زۆر سەرسام بوبو بە زیرەکیەکەی شافیعی گوتی: ئای چەندە زیرەکیت ئەی محمد[٣٨]!!

## خۆشەویستی شافیعی بۆ قورئان...

لەبەرەبەیاندا هەندێك لە فەقیهەکانی میسر چوون بۆلای ئیمامی شافیعی کە لەبەردەستیدا قورئانێك هەبوو.

شافیش بە ئەدەب و وەك مامۆستا گوتی: فیقه سەرقاڵیکردون و بیرتان بەلای قورئانەوە نەماوە! من شەونوێژ دەکەم و قورئان دەخوێنمەوە تاوەکو ڕۆژ دەبێتەوە!

شافیعی دەیگوت: ئەو کەسەی کە قورئان فێر ببێت نرخ و بەهای بەرز دەبێتەوە، ئەوکەسەیشی سەیری فیقه بکات نرخ و بەهای جوان و لەدڵاشیرین دەبێت[٣٩].

## شافیعی لە مانگی ڕەمەزاندا...

قوتابی نەجیب ڕەبیعی کوڕی سولەیمان لەناو خەڵکیدا دانیشت و باسی ژیانی ئیمامی شافیعی بۆ دەکردن لە مانگی ڕەمەزاندا.

گوتی: شافیعی هەموو شەوێك قورئانی خەتم دەکرد، بەڵام کاتێك ڕەمەزان دەهات، شەو جارێك قورئانی خەتم دەکرد و بەڕۆژیش جارێکیتر قورئانی خەتم

[٣٨] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ١٥٦ .

[٣٩] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٢٨١ .

دەکردەوە، بەمشێوەیە شافیعی لە مانگی ڕەمەزاندا شەست جار خەتمی قورئانی دەکرد[40].

## شافیعی و میسر...

کاتێك دایکی سکی پڕ بوو بە شافیعیەوە، بینیبوی کە ئەستێرەی موشتەری لە دامێنیەوە هاتووەتە دەرەوە تاوەکو لە میسردا ئاوابووە، دواتر هەر تیشکێکی چووەتە سەر شارێك.

چوو بۆلای خەونزانێك بۆ ئەوەی ڕاڤەی خەونەکەی بۆ بکات، ئەویش گوتبووی: تۆ منداڵێکت دەبێت کە زانستەکەی تایبەتە بە خەڵکی میسرەوە، بەڵام دواتر بەهەموو وولاتاندا بڵاو دەبێتەوە[41].

## ئەدەبی شافیعی لەگەڵ قوتابیەکانیدا...

بە ڕەوشتی پێغەمبەران و پیاوچاکانەوە شافیعی لەلای قوتابیەکانی دانیشت و فێری دەکردن و شارەزای زانستی دەکردن.

لەوکاتەدا کە ئەو سەرقاڵی ئەوکارە بوو دڵئارامی و هەیبەت باڵیکێشابوو بەسەریدا، ئەبوعوبەید قاسمی کوڕی سەلام هات بۆلای، پیاوێکی زۆر خاکی بوو لەکۆتایی خەڵکەکەوە و لەسەر خۆڵەکە دانیشت.

بەهۆی زۆری شەرم و حەیاکەیەوە بەدەنگێکی زۆر نزمەوە بەوانەی دەوروبەری خۆی گوت: لەبارەی فلاّنە شت و فلاّنە شتەوە پرسیار لە ئەبوعبدالله(شافیعی) بکەن.

---

[40] تاریخ بغداد ب ٢ لا ٦٣.

[41] تاریخ بغداد ب ٢ لا ٥٩ .

شافیعیش لەبەر ڕێزو خۆشەویستی ئەوانەی کە لە دەورووبەری دانشتبوون گوتی: نزیک بەرەوە ئەی ئەبوتوراب.

شافیعی بەم قسەو ئەخلاق و ڕەوشتەجوانەیەوە ویستی کە ئەو شەرم و تەریقبوونەوە لەڕادە بەدەرەی قاسمی کوڕی سەلام نەهێڵێت و بەبێ ترس پرسیار بکات[٤٢].

# عیبادەت و پەرستشی شافیعی...

لە ناوگۆڕەپانی خوداپەرستی و میحرابی عیبادەتدا ئیمامی شافیعی شمشێری هیمەتی خۆی هەڵکێشاو قوڵ و بازوی جیدیەتی لێ هەڵماڵی.

حوسەینی کەرابیسی هاوڕێی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: نزیکەی هەشتا شەو لەگەڵ ئیمامی شافیعیدا مامەوە، نزیکەی سێ یەکی کۆتایی شەو هەڵدەستا و شەونوێژی دەکرد، تەنها پەنجا ئایەتیشی دەخوێند، ئەگەر زۆرتری بکردایە دەیکردە سەد، هەر ئایەتێکی دەخوێند یەکسەر دوعای خێری بۆخۆی و بۆ ئیمانداران بەگشتی دەکرد.

هەرکاتێك ئایەتێکی سزاو عەزابیشی دەخوێند پەنای دەگرت بەخودای گەورەو داوای ڕزگاری خۆی و ئیماندارانی لەئاگری دۆزەخ دەکرد، هەروەك بڵێی لەنێوان ترس و ئومێددا دەژیا[٤٣].

---

[٤٢] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٢٦٨ .

[٤٣] مناقب الشافعي للرازي لا ١٢٧ .

## فیراسەتی شافیعی و محمدی کوڕی حەسەن...

لەنەنیش کەعبەی پیرۆزدا ئیمامی شافیعی و محمدی کوڕی حەسەن دانیشتن، پیاوێك بەلایاندا تێپەڕی، یەکێکیان بەویتریانی گوت: وەرە با فیراسەت لێبدەین و بزانین ئەم پیاوە پیشەکەی چیە.

یەکێکیان گوتی: بەرگدروە. ئەویتریشیان گوتی: دارتاشە، ناردیان بۆ لای و لەبارەی پیشەکەیەوە پرسیاریان لێکرد، پیاوەکەیش گوتی: پێشتر بەرگدرو بووم، بەلأم ئێستە دارتاشم[٤٤].

ڕۆژێکیان پیاوێکی خەڵکی شاری صەنعای یەمەن هات بۆ لای ئیمامی شافیعی، کاتێك شافیعی کابرای بینیبو بە زیرەکی و فیراسەتەوە کە هەروەك بڵێی بەنوری خودا دەبینێت پێی گوتبوو: تۆ خەڵکی صەنعای؟

پیاوەکەیش گوتی: بەڵێ.

ئایا پیشەت ئاسنگەرییە؟

پیاوەکەیش گوتی: بەڵێ[٤٥].

## زیرەکی شافیعی لەگەڵ بوەیتیدا...

لەناو باخچەی زانست و زانیاریدا ڕەبیعی کوڕی سولەیمان و موزەنی و بوەیتی لەلای شافیعی دانیشتن، شافیعیش بە فیراسەت و زیرەکیەوە سەیری کردن.

بە ڕەبیعی گوت: تۆ بەگەنجی دەمریت.

بە موزەنیشی گوت: ئەوەش ئەگەر شەیتان مونازەرەی لەگەڵدا بکات زاڵدەبێت بەسەریدا.

---

[٤٤] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٣٠- ١٣١.

[٤٥] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٣١ .

بە بوەیتیشی گوت: تۆیش بە کۆت و زنجیرەوە دەمریت.

ڕەبیع دەڵێت: لەڕۆژەکانی میحنەتدا چووم بۆلای بوەیتی و دەبینم بەکۆت و زنجیر بەستراوەتەوە[٤٦].

## عیزەتی نەفسی شافیعی...

شافیعی خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بەرەو سامەڕا سەفەر بکات، چوویە ئەو شارەوە، بەڵام جلوبەرگێکی دڕاوو قژێکی درێژی پێوە بوو کە بەهۆی درێژەی گەشتەکەیەوە بەتەواوەتی شێوابوو، چوو بۆلای سەرتاشێك بۆ ئەوەی سەری بۆ بتاشێت.

کابرای سەرتاشیش هەروەك هەژارێکی موحتاج سەیرێکی شافیعی کرد و لەبەر جلوبەرگە دڕاوەکانی زۆر بەزەیی پێدا هاتەوە.

سەرتاشەکەیش گوتی: ئەوە بۆچی ناچیت بۆلای سەرتاشێکیتر، خەریکبوو کارەکەی لەشافیعی ئاڵۆز دەکرد.

ئەوەبوو شافیعی لایکردەوە بەلای خزمەتکارەکەیدا کە لەگەڵیدا بوو.

بەزیرەکی و فیراسەتەوە گوتی: چەندە پارەت پێیە؟

خولامەکەیش گوتی: دە دینار.

گوتی: بیدە بە سەرتاشەکە.

چوونکە شافیعی باش دەیزانی کە سەرتاشەکە لەوە ترساوە کە لەبەرامبەر چاککردنی سەرەکەیدا پارەی نەبێت بیدات.

خولامەکەیش پارەکانی دایە سەرتاشەکە.

[٤٦] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٣٦ . تاریخ ابن عساکر لا ١٥-١٦ .

شافیعیش پاش ئەوەی سەری چاککرد پشتی هەڵکردو ڕۆیشت و بەدەم ڕێگاوە دەیگوت:

***جلوبەرگێکم لەبەردا بوو کە ئەگەر***

***بە یەك فلس بفرۆشرانایە ئەوا فلسەکە زیاتر بوو***

***بەڵام لەناویاندا نەفس و دەرونێك هەیە کە ئەگەر پێوانە بکرێت بە هاوشێوەکانی***

***لەناو هەموو خەڵکیدا ئەوا بەڕێزترو گەورەترە***

***دەمی شمشێر زیان ناکات کە بچێت بەناو***

***شتێکی کەمێك ڕەقدا چوونکە هەرجۆرێك بێت دەردەهێنرێتەوە***

***ئەگەر زەمانە وایلێکردووم کە جلوبەرگەکانم دڕاون***

***خۆ زۆرێك لە شمشێرە گەورەو بڕندەکانیش شکاون***[٤٧]

## شەوی شافیعی...

کاتێك شەودادەهات و تاریکی باڵی دەکێشا بەسەر بوونەوەردا، هیمەتی شافیعی بێدار دەبوویەوە، بەخێراییەوە دەچوو بۆناو میحراب و بە عیبادەت و پەرستنە بە کوڵەکانی تاریکایی شەوی لەناو دەبرد و دەیڕەواندەوە...

هاوڕێی خۆشەویستی شافیعی ڕەبیعی کوڕی سولەیمان باسی شەوەکانی شافیعیمان بۆ دەکات.

دەڵێت: شافیعی شەوی کردبوو بە سێ بەشەوە.

سێیەکی یەکەم: سەرقاڵی نوسین بوو، سێیەکی دووەمیش: نوێژی دەکرد، سێیەکی سێیەمیش: دەخەوت[٤٨].

---

[٤٧] حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٣٠ .

[٤٨] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٥٧ . ومناقب الشافعی للرازی لا ١٢٧ . حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٣٥ .

ڕەبیعی کوڕی سولەیمان باسی شەوی شافیعیمان بۆ دەکات و دەڵێت:

شەوانێکی زۆر لەماڵی شافیعیدا ماومەتەوە و خەوتوم، تەنها کەمێك لە شەو دەخەوت[٤٩].

## شافیعی ئامۆژگاری ئیمامی مالیك دەکات

بەدەنگێکی ئازایانەوە کە لە ناخی دڵەوە دەهاتە دەرەوە، یەکێك لە هاوڕێیانی شافیعی بەناوی عبدالغەنی هات بۆ شاری مەدینە و هەواڵی گەورەی زانایان و ئیمام و پێشەوای ماڵی کۆچ ماڵیکی کوڕی ئەنەسی پرسی.

دەڵێت: بەشافیعیم گوت: ئەی باوکی عبدالله پیاوێکت بینیوە کە وەك ئەنەسی کوڕی مالیك بێت؟

بەڵێ بیستومە کە لەتەمەن و لە زانستیشدا لە ئێمە گەورەترە، خەڵکی دەڵێن: کەسمان نەبینیوە وەك مالیك بێت، ئیتر ئێمە چۆن دەتوانین بیبینین؟!

شافیعی وەك بەگەورەگرتن و سەرسوڕمان بە شافیعی دەڵێت: کاتێك باسی حەدیس بکرایە ئەوا مالیك ئەستێرە بوو[٥٠].

## شافیعی و دەنگخۆشی

شافیعی دەنگێکی خۆشی هەبووە، کاتێك قورئانی دەخوێند خەڵکانی دەوروبەری دەگریاند.

[٤٩] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ١٥٧ .

[٥٠] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٥١٧ .

بەحری کوڕی نەصیر دەڵێت: ئەگەر بمانویستایە بگرین، هەندێکمان بە هەندێکیترمان دەگوت: هەستن بابچین بۆلای ئەو گەنجە مەتڵەبیەو قورئانی لەگەڵدا بخوێنین، کاتێك دەهاتین دەستیدەکرد بە خوێندنی قورئان خەڵکی لەناو کۆڕەکەیدا دەبورانەوە و دەکەوتن و دەنگی شین و گریان بەرز دەبوویەوە. بەڵام کاتێك دەیبینی خەڵکی بەهۆی دەنگە خۆشەکەیەوە دەبورێنەوە و دەگرین، دەوەستاو قورئانی نەدەخوێند[51].

# کەرامەتی شافیعی...

لەپاش بیرکردنەوەیەکی زۆر خەلیفە مەئمون ئیمامی شافیعی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە دادوەر، هەربۆیە نێردراوێکی نارد بۆ ئەوەی بێت بۆلای.

شافیعیش ئەم هەواڵەی بیست، زۆر نەخۆش کەوت، تاوەکو کەوتە سەرجێگە.

ڕۆژێکیان نێردراوەکەی خەلیفە هات بۆ میسر، شافیعیش بیستی کە هاتووە، بە تۆقین و تکاکردنەوە گوتی: خودایا ئەگەر ئەمە خێری بۆ دین و دونیاو عاقیبەتی منی تێدایە ڕێکی بخەیت، وەگەرنا خودا بمبەیتەوە بۆ بەردەم بارەگای خۆت

ئەوەبوو سێ ڕۆژ لەپاش ئەم دووعاویە کۆچی دواییکردو نێردراوەکەی خەلیفە هێشتا لەبەردەم دەرگاکەیدا بوو[52].

# ڕەوشتی شافیعی...

شافیعی کەسێکی ڕەوشت جوان و خۆشکێن بووە، خەڵکی دەهاتن بۆلای زیاتر لەبەر ئەدەبەکەی دواتر بۆ زانستەکەی سەردانیان دەکرد.

---

[51] تاریخ بغداد ب ٢ لا ٦٤ .

[52] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ١٥٥ – ١٥٦ .

ڕۆژێکیان بوەیتی نامەیەکی نوسی بۆ ڕەبیعی کوڕی سولەیمان و داوای لێکرد کە باسی هەندێك لە خورەوشتی شافیعی بۆ بکات:

ئەویش بۆی نوسی: خۆڕاگربە لەگەڵ کەسە غەریبەکاندا، ڕەوشتجوانبە لەگەڵ ئامادەبوانی ناو وانەکانتدا، من هەمیشەو بەردەوام ئەمانەم لە شافیعیەوە بیستووە، هەروەها لە شیعرێکدا دەڵێت:

نەفسی خۆم دەشکێنم بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بەڕێزەوە سەیری بکەن

ئەو نەفسەی کە خۆشکێنی نەکات بەهیچ شێوەیەك خەڵکی ڕێزی لێناگرن[٥٣].

## شەرەفی شافیعی...

بەوپەڕی هەیبەت و عیزەتەوە محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی چوو بۆلای هەندێك لە منداڵانی خەلافەت، کە ئیبن دەئبیشیان لەلا بوو سڵاوی لێکرد.

ئەویش گوتی: تۆ کێیت؟

شافیعی گوتی: لە نەوەکانی مەتڵەبم.

ئەویش بەپەلە گوتی: مەتڵەبی کوڕی ئەبی ویداعە، یان مەتڵەبی کوڕی حەنتەب؟

شافیعی گوتی: نەخێر مەتڵەبی کوڕی عبدالمەناف.

ئیبن دەئب دەستی کێشا بەسەر ڕانیدا و گوتی: خودا چاکە بۆ ئەمیر بکات، سوێند بەخودا ئەمە نەوەی عبدالموتەلیبی کوڕی عەبد المەنافە، کە باوك و باپیری باوك و باوپیری تۆیشن، براکانیشی: هاشم و عەبد شەمسن، کە مامناوەندی هەردووکیان بوو لەبەر ڕێز شەرەفی لە سەردەمی نەفامیدا، ئەوەیان عاباکەی خۆی

[٥٣] تاریخ بغداد لا ١٢ – ١٣.

بۆ دادەناو ئەویش پاڵیپێوە دەدا و دەخەوت، کاتێك خەبەری دەبوویەوە ئەویتریشیان عاباکەی خۆی بۆ ڕادەخست و لەسەری دادەنیشت[٥٤].

## شافیعی جلەکانی بەدیاری دەبەخشێت بە هاوڕێکەی...

ئێوارەیەکیان درەنگانێك شافیعی لەگەڵ ئیبراهیمی کوڕی بوەیهدا چوویە حەمامەوە، هەردووکیان لە جەستەدا وەك یەك بوون، سەرەتا ئیبراهیم لەناو گەرماوەکە هاتە دەرەوەو جلوبەرگەکانی شافیعی لەبەر کردبوو، شافیعیش هاتە دەرەوەو جلوبەرگەکانی ئەوی لەبەر کردو نەیزانی کە جلەکانی ئیبراهیمە.

کاتێك شافیعی چوویەوە بۆ ماڵی خۆیان و سەیری جلەکانیکرد، زانی کە جلوبەرگەکانی ئیبراهیمی لەبەر کردووە، هەربۆیە دایکەندن و بە خێزانەکەی گوت: کۆیان بکەرەوە و بۆنخۆشیان لێبدەن و خستیانە ناو دەسماڵێکەوە، ئیبراهیمیش سەیری جلوبەرگوکانی بەری کرد، دەبینێت کە جلەکانی شافیعیە، ئەویشت خستنیە ناو دەسماڵێکەوە.

لەکاتی نوێژی عەسردا شافیعی سەیری ئیبراهیمی کرد و زەردەخەنەیەکی کرد، کاتێك نوێژەکە تەواو بوو.

ئیبراهیم چوبۆلای شافیعی و گوتی: خودا چاکت بۆ بکات، ئەوە جلوبەرگەکانی تۆیە.

شافیعیش گوتی: ئەمەیش جلوبەرگەکانی تۆیە، سوێند بەخودا نایاندەیتەوە بەمن و بێجگە لەتۆ کەسیتریش لەبەریان ناکات!

---

[٥٤] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٨٢ .

ئیراهیم جلەکانی خۆی و جلوبەرگەکانی شافیعیشی بردەوە بۆ ماڵەوەو هەڵیگرتن بۆخۆی[٥٥].

## شانازیکردنی پاشاو مەلیکەکان بە شافیعیەوە...

بەوپەڕی هەیبەت و ویقارەوە شافیعی چوو بۆلای ئەمیری ئیمانداران خەلیفە هارونە ڕەشید، بەزمان و ئەقڵی دەستیکردە باسکردنی مەسەلەکان و شتە قورسەکانی شیکار دەکرد، شاراوەکانی ئاشکرا دەکرد، ئاڵۆزەکانی ڕووندەکردەوە، مونازەرەی لەگەڵ زانایاندا دەکرد، لەگەڵ شاعیرو ڕەوانبێژەکاندا دادەنیشت و قسەو گفتوگۆی دەکرد، وەڵامی فەقیهەکانی دەدایەوە، فرۆفێڵی کەسانی زیرەك و بلیمەتی ئاشکرا دەکرد.

هەربۆیە خەلیفە هارونە ڕەشید زۆر حەزی دەکرد کە لەگەڵ ئیمامی شافیعیدا دابنیشێت و زۆر سەرسام بوو پێی.

دواتر بە ڕوویەکی بەختەوەرانەوە گوتی: خودای گەورە لەناو ماڵو منداڵەکانی مندا هاوشێوەی تۆ دروستبکات[٥٦].

## خولام و لقە درەختەکە...

ڕۆژێکیان شافیعی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، خزمەتکارێکی خۆی بینی کە لقە درەختێکی بەسەرشان هەڵگرتووە، ئەیەوێت بە نهێنی و بەبێ ئەوەی کەس پێی بزانێت بچێتە دەرەوە.

شافیعی گوتی: ئەمە چیە؟

---

[٥٥] حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٣٣ – ١٣٤ .

[٥٦] مناقب الشافعي للبيهقي ١ لا ٨٣ .

خولامەکەیش گوتی: گەورەم ئەی خۆت نەتگوتووە کەسێك کە شتێکی پێبوو ئەوە شیاوترە کە بۆ ئەو بێت تاوەکو بەڵگەیەك هەبێت لەوبارەیەوە.

شافیعیش گوتی: بەڵێ.

خولامەکەیش گوتی: دەی کەوابوو ئەم لقە دارەیش بەدەستی منەوەیە، تۆ بەڵگە بهێنە و بیسەلمێنە کە هی تۆیە.

شافیعیش بەقسەی خولامەکە پێکەنی و وازی لێهێناو لقە دارەکەی برد بۆخۆی[٥٧].

## خۆشەویستی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بۆ شافیعی...

خۆشەویستی شافیعی لەناو دڵ و دەروونی ئیمامی ئەحمەددا هێلانەی کردبوو، کاتێك ئیمام ئەحمەد لەناو هاوەڵانیدا دادەنیشت یەکسەر دەستیدەکردە گێڕانەوەی ژیانی ئیمامی شافیعی.

گوتی: من چل ساڵە لە نویژەکانمدا دوعا بۆ شافیعی دەکەم و دەڵێم: خودا لەخۆم و لەدایکو باوکم و لە محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی خۆشبە.

ڕۆژێکیان کوڕەکەی ئیمامی شافیعی چووبۆلای ئیمام ئەحمەد، ئیمام ئەحمەدیش ڕووی گەشایەوە و زۆر دڵخۆش بوو بە بینینی.

دواتر بە زەردەخەنە و ڕوویەکی خۆشەوە پێی گوت: تۆ پیاوێکی قورەیشیت و کوڕی ئەبی عبداللەی شافیعیت و لە ئەهلی سوننەیت[٥٨].

---

[٥٧] حلية الاولياء ب ٩ لا ١٣٣.

[٥٨] توالي التأسيس لا ٤٥ . مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٧٧ .

# پیاوێك سوێند لەسەر ژنەکەی دەخوات...

پیاوێك هات بۆلای ئیمامی شافیعی و بەشوێن چارەسەرەێکدا دەگەڕاو لەبارەی پیاوێکەوە پرسیاری لێدەکرد کە خورمایەکی خستووەتە ناو دەمیەوە.

دواتر بە ژنەکەی گوتووە: تەلاقت کەوتبێت ئەگەر بیخۆم یان بیتفمەوە.

شافیعیش بەهێمنی زنایان و دانایان و فەقیهو شارەزایان و بەوپەڕی زیرەکیەوە گوتی: با نیوەی بخوات و نیوەکەی تری بتفێتەوە[59].

# بەهێزی زانستی شافیعی لەبارەی نەسەبەکانەوە...

شافیعی دانیشتبوو کۆمەڵێکیش لە قوتابیانی زانست بەدەوریدا کۆبوبونەوە و بە ئەدەب و حەزو ئارەزووەوە گوێیان بۆ گرتبوو.

لەوکاتەدا ئیبن هیشام خاوەنی کتێبی سیرە و مەغازی هات بۆلای، لەلای شافیعی دانیشت و باسی نەسەبی پیاوەکانی بۆ دەکرد، شافیعیش بلیمەتی و شارەزاییەکی بێوێنەی لە لەبەرکردنی نەسەبی پیاوەکاندا نیشاندا.

لەپاش کەمێك لە پرسیارو وەلاّم.

شافیعی بە ئیبن هیشامی گوت: ئەی ئیبن هیشام واز لە نەسەبی پیاوەکان بهێنە، چوونکە ئەوە لەدەستی ئێمە دەرناچێت، وەرە باباسی نەسەبی ژنان بکەین.

شافیعی بەزمانێکی پاراوو بەوپەڕی زیرەکی و هێزەوە باسی نەسەبی ژنانی دەکرد، ئەوەبوو ئیبن هیشام بێدەنگبوو نەیتوانی لەگەڵ شافیعیدا بڕوات[60].

---

[59] حلية الاولياء ب ٩ لا ١٤٣ .

[60] توالى التأسيس لا ٦٠ . مناقب الشافعى للبيهقى ب ١ لا ٤٨٨.

## ئەدەبی شافیعی لەگەڵ دژەکانیدا...

یونسی صەدەفی دانیشتبوو باسی ئەدەب و ئەخلاقی شافیعی دەکرد بۆ هاوەڵانی خۆی.

گوتی: کەسم نەبینیوە هێندەی شافیعی ئاقڵ بێت، پاش ئەوەی مونازەرەیەکی توندم لەگەڵدا کرد لەسەر مەسەلەیەك، دواتر جیابووینەوە، کاتێك پێمگەیشت هات و توند دەستیگرتم.

دواتر گوتی: ئەی ئەبوموسا ئایا باشتر وا نیە کە ببینە برای یەکتری هەرچەندە لەسەر کۆمەڵێك مەسەلەیش لەگەڵ یەکتریدا هاورا نەبین[٦١].

## شافیعی نەعلەکەی چاکدەکاتەوە...

لەناو کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا، ئیمامی شافیعی لە مزگەوتێکی میسر هاتە دەرەوە، لەوکاتەدا بەرێگادا دەچوو، نەعلەکەی بچڕا، پیاوێك هات و بەخێرایی نەعلەکەی ئیمامی شافیعی چاککردەوە، دواتر دایەوە دەستی.

شافیعی بە ڕەبیعی هاورێی گوت: ئەی ڕەبیع ئایا هیچ پارەیەکت پێیە؟

گوتی: بەڵێ.

شافیعی گوتی: چەندت پێیە؟

گوتی: حەوت دینار.

شافیعیش بەدڵێکی فراوانەوە گوتی: بیدە بەوپیاوە.

پیاوەکەیش بەدڵخۆشیەوە دینارەکانی وەرگرت و ڕۆیشت[٦٢].

[٦١] سیر اعلام النبلاء لا ١٠ — ١٦ .

[٦٢] مناقب الشافعی ب ٢ لا ٢٢١ .

# شافیعی و موزەنی...

بیرکردنەوە خەوی لەچاوەکانی موزەنی تۆراند، تاوەکو تووشی بێتاقەتی و خەمو پەژارەی کرد.

موزەنی گوتی: لەبەرخۆمەوە گوتم خۆزگایە کەسێك ئەوەی لە دەرونمدایە سەبارەت بە مەسەلەی تەوحیدی یەکتاپەرستی بیزانیایە و دەری بهێنایە، ئەوەبوو چوم بۆلای ئیمامی شافیعی لەناو مزگەوتی میسردا.

کاتێك چوومە بەردەمی گوتم: لە دڵ و دەرونمدا مەسەلەیەکی خەوشدار لەبارەی یەکتاپەرستیەوە دروستبووە(دواتر بۆم باسکرد) منیش زانیم کەس هێندەی تۆ شارەزا نیە لەوبارەیەوە، ئادەی بزانم چی دەڵێیت؟

شافیعی تورە بوو ڕەنگی دەموچاوی گۆڕدرا، دواتر پێی گوت: ئەوەی کە لەناو بیرو زەینتدا هێلانەی کردووە دەری بهێنە، ئایا دەزانی تۆ لەکوێیت؟

موزەنی گوتی: بەڵێ.

شافیعی گوتی: ئەوە ئەو بابەتەیە کە خودا فیرعەونی بەهۆیەوە نغرۆ کرد، ئایا بیستوتە کە پێغەمبەری خودا فەرمانیکردبێت کە لەوبارەیەوە پرسیار بکرێت؟

گوتی: نەخێر .

شافیعیش گوتی: ئایا هاوەڵان قەسەیان لەسەر کردووە ؟

گوتی: نەخێر.

شافیعی گوتی: دەزانی چەند ئەستێرە لە ئاسماندا هەیە ؟

گوتی: نەخێر:

شافیعی گوتی: دەزانی چەند ئەستێرەیان ڕەگەزیان ناسراوەو لەچی دروستکراون؟

گوتی نەخێر.

شافیعیش گوتی: باشە شتێك كە لە بوونەوەراندایە و تۆ لێی تیناگەیت، چۆن دەتوانیت بیر لە زانستی بەدیهێنەرەكەیان بكەیتەوە؟!

دواتر شافیعی سەبارەت بە مەسەلەیەك لە دەستنوێژدا پرسیاری لێكرد، پیاوەكەیش لەوەلامەكەیدا هەڵەی كرد.

شافیعی گوتی: شتێك كە لە ڕۆژێكدا پێنج جار پێویستت پێیەتی واز دەهێنیت لەوەی كە زانیاریت لەبارەیەوە هەبێت، بەلام دێیت و سەبارەت بە زانستی خالیق و ئافەرێنەری بوونەوەر قسەو پرسیار دەكەیت؟!

دواتر ڕوویتێكردو گوتی: ئەگەر ئەمجارە ئەمە بەدڵ و دەروونتدا هاتەوە، یەكسەر تەوبە بكەو بگەڕێرەوە بۆلای خودا. موزەنیش دەڵێت: منیش تەوبەم كرد و گەڕامەوە بۆلای خوداو لەو بیرو فیكرەم پەشیمان بوومەوە[٦٣].

## شافیعی و پاداشتی نەخۆشی...

شافیعی كەوتە سەر جێگەو نەخۆش كەوت، جەستەی زۆر لاوازبوو، هێزی لەبەردا نەبوو، یەكێك لە بەرپرسانی میسر هات بۆ سەردانی.

پێی گوت: ئەی باوكی عبدالله، مرۆڤ لە نەخۆشیدا ئیسراحەت ناكات مەگەر بەهۆی زۆری ئەو كەسانەوە نەبێت كە سەردانی دەكەن؟

شافیعیش بەدەنگێكی گەڕیدە بەشوێن پاداشتی خوداییداو ترساو لە گوناحو تاوان گوتی: براكەم هیچ ئیسراحەتێك لە نەخۆشیدا نیە، بێجگە لە هیواداربوون بە پاداشتی خودا و سڕینەوەی گوناهەكانی مرۆڤ نەبێت[٦٤].

---

[٦٣] سیر اعلام النبلاء ب ١٠ لا ٣٢ – ٣٣ .

[٦٤] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٧٤ .

# شافیعی و بەڵای نەخۆشی...

نەخۆشی گەمارۆی شافیعی دا و خستیە سەر جێگەو وایلێکرد کە نەتوانێت لەماڵ بچێتە دەرەوە.

شافیعیش بەزمانێکی ڕەزامەندی و سوپاسگوزارییەوە کە قسە لەگەڵ خودای خۆیدا دەکات گوتی: ئەگەر ئەمە دەبێتە هۆی ڕەزامەندی تۆ لەمن، دەسا خودایە نەخۆشییەکەم زیاتر بکە.

ئەم قسەیەی ئیمامی شافیعی گەیشتەوە کە خوداپەرستی زاهید ئیدریسی خولانی و نامەیەکی بۆ ناردو پێی گوت: ئەی باوکی عبدالله من و تۆ پیاوی بەڵاو موسیبەت و نەخۆشی نین.

شافیعیش لەوەڵامی نامەکەیدا بۆی نوسی و گوتی: ئەی باوکی عەمر دوعای بەخێرم بۆ بکە[٦٥].

# شافیعی و پزیشکەکە...

بەدڵێکەوە کە هەوری دڵتەنگی دایپۆشیبوو، بەدەموچاوێکەوە کە پڕ بوو لە تاڵی و ئازار و خەمو پەژارە، لەکاتی نەخۆشییەکەی شافیعیدا موزەنی چوو بۆلای و سەردانیکرد، خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

پێم گوت: ئێستە چۆنی؟

شافیعیش گوتی: ڕۆزی خۆم دەخۆم و چاوەڕێی ئەجەلم دەکەم.

منیش گوتم: با پزیشکێکت بۆ بانگبکەم؟

شافیعیش گوتی: بانگی بکە.

[٦٥] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ١٦٠.

ئەوەبوو پزیشکێکی گاورم بۆ هێنا، کاتێك پزیشکەکە دەستی شافیعی گرت، ناوبراو هەستیکرد کە پزیشکەکە نەخۆشییەکی هەیە.

هەربۆیە ئەم شیعرەی گوت:

***پزیشکت هات بۆلام بۆ ئەوەی پشکنینم بۆبکات***

***دەبینم پزیشکەکەی حاڵی تەواو نیە***

***بەنەخۆشیەکەیەوە دەستیکردە چارەسەرکردنم***

***زۆر سەیرە کە کەسێکی چاوکز ببێتە پزیشکی چاو! !***

موزەنی دەڵێت: پاش چەند رۆژێك هەواڵمان زانی کە پزیشکەکە مردووە.

بە شافیعیان گوت: پزیشکەکە مرد.

ئەویش بەم شیعرە وەڵامیدایەوە و گوتی:

***پزیشکەکە بە زانستە پزیشکی و دەرمانەکەیەوە***

***نەیتوانی قەزاو قەدەری خودا بووەستێنێت***

***نابێت پزیشك بەو دەردەوە بمرێت کە***

***بڕیارە کە چارەسەری ئەو دەردەی خەڵکی بکات***

***چارەسەرکەرو چارەسەرکراو لەناو چوون***

هەروەها ئەوەی کە دەرمانەکەی هێناو فرۆشتی و ئەوەیش کە کڕی فەوتان[٦٦].

## هیمەت بەرزی شافیعی.....

بە هیمەتێکی بەرزەوە کە ماندبونی نەدەناسی، شافیعی بە حەزو ئارەزوویەکی زۆرەوە روویکردە زانست و کتێبەکان و هەموو شەوەکانی بە نوسین و دانانی کتێبەوە بەسەر برد.

---

[٦٦] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ٢٩٦ .

حومەیدی کە یەکێکە لە هاوەڵانی شافیعی دەڵێت: لەگەڵ شافیعیدا چووم بۆ میسر، لەماڵێکی دووقاتدا بووین، ئەو لەسەرەوە بوو منیش لە خوارەوە، هەندێك شەو خەبەرم دەبوویەوە و دەبینم چراکەی داگیرساوە، منیش خولامەکەیم بانگدەکرد.

شافیعیش دەنگی دەبیستم و دەیگوت: تکات لێدەکەم هێمن بە، منیش بێدەنگ دەبووم، دەبینم قەڵەم و کاغەزی لەبەردەستدایەو دەنوسێت.

منیش دەمگوت: بەسە ئەی باوکی عبدالله.

ئەویش دەیگوت: بیرم لەمانای حەدیسێك یان مەسەلەیەك دەکردەوە، لەوە دەترسام کە لەبیرم بچێتەوە، هەربۆیە داوای چراکەم دەکرد و دەمنوسیەوە[٦٧].

شافیعی زیاتر لە تاریکاییدا بیری دەکردەوە، دواتر داوای چرای دەکرد و هەموو شەوەکە سەرقاڵی نوسینەوە دەبوو.

پێیانگوت: ئەی باوکی عبدالله بۆچی پێشتر چراکە داناگیرسێنیت؟

شافیعیش دەیگوت: چراکە دڵم سەرقاڵ دەکات و ناتوانم زۆر بیر بکەمەوە[٦٨].

## دەست و دڵئاوایی شافیعی...

شافیعی چەند دیرهەمێکی دایە دەستی ڕەبیعی کوڕی سولەیمانی قوتابی خۆی، بە نەرم و نیانیەوە پێی گوت: ئەی ڕەبیع بەم دیرهەمانە گۆشتمان بۆ بکڕە.

ڕەبیع ڕۆیشت و ماسیی کڕی، کاتێك هاتەوە و ماسیەکانی بەدەستەوە بوو، چوویە لای ئیمامی شافیعی شەیخ و مامۆستای خۆی، ئەویش بە ئەدەب و دڵو

[٦٧] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ٢٤٣ .

[٦٨] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ٢٣٨ .

دەرونێکی پاکەوە گوتی: ئەی ڕەبیع من گوتم گۆشتمان بۆ بکڕە بەڵام تۆ چویت ماسیت کڕیوە.

ڕەبیع گوتی: ئیتر ئاوا ڕێککەوت.

شافیعیش گوتی: ئەمڕۆ ئەوە دەخۆین کە تۆ حەزت لێیەتی، بەڵام بەیانی ئەوە دەخۆین کە ئێمە حەزمان لێیەتی[٦٩].

# شافیعی و دایکی بیشر...

بەدڵێکی شکاوی خەمبارەوە کە خۆشی شادومانی لێ تۆرابوو، دایکی بیشری موریسی هات بۆلای ئیمامی شافیعی.

پێی گوت: ئەی باوکی عبداللە بیشری کوڕم خۆشی دەوێیت، ئەگەر لەلای ئەودا باست بکرێت ڕێزت لێدەنێت و بەگەورەت دەگرێت، تکات لێدەکەم کە ئامۆژگاری بکەیت بەڵکو لەو بیرو بۆچونانەی واز بهێنێت چوونکە خەڵکی دووژمنایەتی زۆری دەکەن، (بیشر سەرقاڵی عیلمی کەلام بوو باوەڕی بە خەڵقی قورئان هەبوو).

شافیعیش دڵی ژنەکەی خۆش کرد و گوتی: دڵنیابە هەوڵی خۆمی لەگەڵدا دەدەم.

شافیعی بیشری بانگکرد و لەو هەڵەگەورەیەی ئاگاداری کردەوە و پەردەی لەسەر هەڵەکەی لاداو پێی گوت: پێم بڵێ ئایائەوەی کە تۆ بانگەشەی بۆ دەکەیت کتێبێکی گۆیای لەبارەوە هەیە، یان کەسێك فەرزی کردووە، یان سوننەتێکی جێبەجێکراوە، تاوەکو واجیب بێت لەسەر خەڵکی کە باس و خواس و پرسیاری لەبارەوە بکەن؟!!

بیشر گوتی: نەخێر.

---

[٦٩] حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٣٢ .

شافیعی گوتی: تۆ خۆت خستووەتە هەڵەیەکی گەورەوە، باشە تۆ لە حەدیس و فیقە چی دەزانیت؟

بیشریش گوتی: تۆمەتیان بۆ هەڵبەستوم، دواتر هەستاو بەتوڕەییەوە ڕۆیشت.

شافیعی گوتی: بیشر بەهیچ شێوەیەك سەرکەوتوو نابێت[٧٠].

## شافیعی و منداڵەکە...

شافیعی لەکاتی نیوەڕۆدا سەعاتێکی دیارکردبوو تێیدا دەخەوت، هەربۆیە حەزی نەدەکرد کە هیچکەسێك خەبەری بکاتەوە.

ڕۆژێکیان ژنێك هات و منداڵێکی پێبوو، شافیعیش خەوی لێکەوتبوو، منداڵەکە گریا، ژنەکەیش خێرا دەستی خستە سەردەمی منداڵەکە بۆ ئەوەی دەنگەکەی شافیعی خەبەر نەکاتەوە، هەربۆیە پێش ئەوەی شافیعی خەبەری ببێتەوە چوویە دەرەوەی ماڵەکەوە، دەرگای حەوشەکە کەمێك دوور بوو هەربۆیە خەریکبوو منداڵەکە بخنکێت.

کاتێك شافیعی خەبەری بوویەوە ئوم عوسمانی خێزانی پێی گوت: هاوار بەماڵت ئەی کوڕی ئیدریس خەریکبوو کەسێك بکوژیت! ئەویش دەموچاوی سور بوویەوە و ئارەقی کرد.

بە شڵەژانێکەوە گوتی: چۆن؟!

ژنەکەیشی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەوەبوو سوێندی خوارد ئیتر بەهیچ شێوەیەك لە ڕۆژدا سەرخەو نەشکێنێت، هەرکاتێکیش ڕاکشا دەستاڕەکەی ماڵەوە بهێنن و لەپاڵ سەریدا ئیشی پێبکەن.

---

[٧٠] حلية الاولياء ب ٩ لا ١١٠ – ١١١ .

لەو ڕۆژە بەدواوە هەرکاتێك بخەوتایە یەکسەر دەستارەکەیان دەهێناو لەپاڵ سەریدا کاریان پێدەکرد[71].

## شافیعی و قوتابخانەی بۆچوون(مدرسه الرأی)...

پیاوانی حەدیسزان خەوتبوون تاوەکو شافیعی هات و هەموویانی خەبەر کردەوە، مەدرەسەی بەغدادیش کە هاوەڵانی ئەبوحەنیفە بوون کەس نەبوو لە زانست و زانیاریدا شانبدات لەشانیان، تاوەکو ئیمامی شافیعی چوو بۆ شاری بەغداد.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: ئێمە وەك پیاوانی حەدیس هەموو کاروبارێکمان لەدەستی هاوەڵانی ئەبوحەنیفەدا بوو، لەدەستیان دەرنەهێنرا تاوەکو شافیعی هات و بینیمان، کە شارەزاترین کەس بوو لە کتێبەکەی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا، هەرگیز بە گەڕانی کەم بەشوێن حەدیسدا ڕازی نەبووە.

ئیبراهیمی حەربی دەڵێت: شافیعی هاتە بەغداد، لەناو مزگەوتی گەورەی خۆرئاوای شاردا بیست ئەڵقەی وانە ووتنەوەی مەدرەسەی ڕەئی هەبوون، بەڵام بۆ هەینی دواتر تەنها سێ یان چوار ئەڵقەیان لەلای مەدرەسەی ڕەئی مانەوە[72].

## شافیعی و دینارەکان...

ڕۆژێکیان شافیعی چوو بۆلای هارونە ڕەشید، هارونیش فەرمانیکرد کە هەزار دیناری وەك بەخشیش پێبدەن، دواتر ڕۆیشت.

[71] حلية الاولياء ب ٩ لا ١٢٦ .

[72] حلية الاولياء ب ٩ لا ١٣١.

هارونە ڕەشیدیش فەرمانی بە خزمەتکارەکەی خۆی کرد کە چاودێری شافیعی بکات و شوێنی بکەوێت و بزانێت چی لە دنیارەکان دەکات.

کاتێك شافیعی لەلای هارونە ڕەشید هاتە دەرەوە، دەستیکردە بەخشینەوەی دینارەکان تاوەکو هەمووی تەواو کرد، تەنها چەند دینارێك مایەوە و دایبەخولامەکەی و پێی گوت: سودیان لێوەربگرە.

خزمەتکارەکەیش گەڕایەوە لای ئەمیری ئیمانداران و باسی ئەوەی کرد کە شافیعی چی بە دینارەکان کردووە.

هارونە ڕەشید بەدەنگێکی زۆر سەرسامانەوە گوتی: هەر لەبەر ئەمەیە کە خەموپەژارەی نیە و هەمیشە پشتقایمە بە خودای خۆی[٧٣].

## ئەوەی بۆ خودا بێت بەردەوامەو دوابڕاو نابێت...

لە باخچەی زانستدا شافیعی دانیشت و پێنوسی گرت بەدەستیەوە و دەستیکردە نوسینی کتێبێك سەبارەت بە بیرو بۆچوون و وەلامی ئەو پرسیارانەی کە لێی دەکران.

لەوکاتەدا کە خەریکی نەخشاندنی ووشە جوانەکانی ناو کتێبەکەی بوو، موزەنی هات بۆلای.

پێی گوت: ڕەحمەتی خودات لێبێت هاوەلانت مالیك و ئەبو حەنیفە کتێبانێکی زۆریان نوسیوە، زۆر لەتۆ زیاتریش ئیجتیهادیان کردووە.

شافیعیش لە نوسین وەستاو گوتی: ئەی ئیبراهیم ئەوان دەنوسن و ئێمەیش دەنوسین، ئەوەی بۆ خودا بێت بەردەوامە و دوابڕاو نابێت[٧٤].

[٧٣] تأريخ بغداد ب ٢ لا ٦٨.

[٧٤] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ١٧٧ .

ئەوەبوو قەدەری خودا وابوو کە کتێبەکانی شافیعی زیاتر بمێننەوە، تەنانەت ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە ژنێکی لە ناوچەی مەرو هێنا، کە پێشتر پاوەکەی مردبوو کتێبەکانی شافیعی هەبوون، ئەمیش تەنها لەبەر ئەوەی کە کتێبەکانی شافیعی دەستبکەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ژنەدا کرد[٧٥].

## ئاقڵترینی خەڵکی دوونیا....

بەوپەڕی سەرسامی و دڵەڕاوکێوە پیاوێك هات بۆلای ئیمامی شافیعی و لەبارەی مەسەلەیەکەوە پرسیاری لێکرد کە خەریکبوو ئەقڵ و ژیری هەمویان ببات، کاتێك پیاوەکە لەلای شافیعی دانیشت.

بە دوو لێوەی ووشکی لەرزۆکەوە گوتی: پیاوێك وەسیەتی کردووە کە میراسەکەی بدرێت بە ئاقڵترین کەسی خەڵکی شارەکەی، تۆیش دەزانیت ئاقڵەکان زۆرن، ئایا ئەو میراسەی بەکێ دەدرێت؟

ئیمامی شافیعی شارەزا بە نهێنیەکانی مەسەلە زانستیەکانیش گوتی: ئەو ماڵ و میراسە دەدرێت بە زاهیدترینی ئەو کەسانەی کە ئاقڵترینەکانی خەڵکین، چوونکە هەرکەسێك ئەوەی خۆشبوێت کە خودا تورە دەکات هیچ ئەقڵ و فامێکی نیە[٧٦].

## شافیعی و کەنیزەکە لێزانەکە....

شافیعی لە هەموو کەسێك بەخشندەترو دەست و دڵئاواتر بوو، هەروەك شنەبای بەهار بەخشندە بوو، زیاتر ئەو کەنیزەکانەی دەکڕی کە دەیانزانی چێشت لێبنێن و جۆرەکانی شیرینیان دروستدەکرد.

---

[٧٥] اداب الشافعي لا ٦٤ .

[٧٦] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ١٨٣ .

دواتر هاوەڵان و قوتابیەکانی دەهێناو پێی دەگوتن: ئەوەی حەزتان لێیە بیخۆن، کەنیزەکێکم کڕیوە ئەوەی کە ئێوە حەزتان لێیەتی دەتوانێت دروستیبکات.

قوتابیان و زانستخوازان و هاوڕێیانی فەرمانیان بە کەنیزەکەکە دەکرد کە هەموجۆرە شیرینی و خواردنێکیان بۆ دروستبکات، ئیمامی شافیعیش بەدڵخۆشی و بەختەوەرییەوە سەیری ئەم دیمەنانەی دەکرد[٧٧].

## شافیعی و هەژارەکە...

شافیعی لەناو هاوڕێیانیدا دانیشت بۆ ئەوەی نووری زانست بڕێژێتە ناو دڵ و دەرونیانەوە، لەوکاتەدا کە ئەوان دڵ و دەرونی خۆیان بە پاراوی زانست تێرئاو دەکرد، پیاوێکی هەژاری داماوی نەدار هات بۆلایان.

داوای شتێکی لە شافیعی کردو پێی گوت: من پیاوێکم ئاواو ئاوام فەرمانبکە با شتێکم پێبدەن؟

شافیعیش تەنها یەك دیناری پێبوو، ئەویشی بەخشی بە پیاوەکە.

هەندێك لە هاونشینەکانی پێیانگوت: ئەوە ئەگەر دیرهەمێك یان دوو دیرهەمت پێبدابایە زۆریش بوو بۆ ئەو.

شافیعیش بەدڵێکی لێبوردەی ڕایزەوە گوتی: من شەرم دەکەم لەوەی کە پیاوێك داوای شتێکم لێبکات و بتوانم پێی بدەم بەڵام نەیدەمێ[٧٨]!

---

[٧٧] حلیة الاولیاء ب ٩ ل ١٣٠ .

[٧٨] حلیة الاولیاء ب ٩ ل ١٣٠ .

# بەخشندەیی شافیعی...

بە پێیانێکیماندووەوە، بەدڵێکیش کە لێدانەکانی زۆر دەبوون، بە دوو لێوی شڵەژاوەوە، شافیعی چوویە لای ئەمیری ئیمانداران خەلیفە هارونە ڕەشید.

ڕەشیدپێی گوت: ئەی شافیعی برام بەتەواوەتی شوێت لێهەڵکێشاوە و گوێڕایەڵیمان ناکەیت، لەگەڵ عەلەوییەکاندا لەدژمان هەڵگەڕاویتەوە؟!

شافیعی گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئایا دەکرێت بە کەسێك کە دەڵێت من کوڕی مامی تۆم بڵێم ئامۆزا؟ یان بچم بۆلای هۆزێك و ببمە خزمەتکاریان هەرتەنها لەبەر ئەوەی کە دەڵێن: تۆ عەبدو خزمەتکاری ئێمەیت؟

ئەم قسانەی شافیعی کاریگەرییەکی گەورەیان کردە سەر دڵ دەرونی هارونە ڕەشید، زۆر دڵی گەشایەوە بە شافیعی و هەشتا هەزار دیرهەم بەخشیشی پێدا.

شافیعیش چوویە دەرەوە و پیاوێکی کەڵەشاخچی بینی و هەشتا دیناری پێدا، ڕەشیدیش لەسەر ئەمکارەی ڕەخنەی لێگرت و لۆمەی کرد.

شافیعیش بەم شیعرە وەڵامی خەلیفە هارونە ڕەشید دەداتەوە و دەڵێت:

***ئەگەر دەستەکانم کێشەم بۆ دروستدەکەن لەسەر هەڵسوکەوتێکم***

***ئەوا پێمدەگوتن واز لەوکارە بهێنن یان بەردەوامبم لەسەری***

***سیفەتم بەخشندەیە و نەفسیشم قسەم لەگەڵدا ناکات***

***پێمناڵێت کە خودا بەبێ ڕزق و ڕۆزی وازم لێدەهێنێت***

***سڵاو ئەی بەخشندەییەکەم دووبارە سڵاوت لێبێت***

***سێبارەیش سڵاوت لەسەر بێت لەبارەی ئەوەی کە بانگم دەکەیت بۆلای[٧٩].***

[٧٩] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ٢٢٦ – ٢٢٧ .

# گوێکانتان پاکبکەنەوە...

ڕۆژێکیان ئیمامی شافیعی لەناو بازاڕی چرا فرۆشەکان بەرەو ماڵی خۆیان دەگەڕایەوە، لەگەڵ کۆمەڵێك لە قوتابییەکانیدا بوو لە پێشیانەوە دەڕۆیشت، لەوکاتەی کە بەڕێگادا دەڕۆیشتن، پیاوێکیان لەگەڵدا بوو کە سوکایەتیەکی زۆری بە یەکێك لە پیاوانی ئەهلی زانست دەکرد.

شافیعیش لایکردەوە بەلای هاوەڵانیدا و ئامۆژگاری دەکردن: گوێکانتان لە گوێگرتن بۆ قسەی ناشیرین پاکبکەنەوە، هەروەك چۆن زمانتان لە قسەی ناشیرین دەپارێزن، چوونکە گوێگر هاوەڵ و شەریکی قسەکەرەکەیە، مرۆڤی کەم ئەقڵ سەیری پیسترین شت دەکات لە هەگبەکەیدا و سورە لەسەر ئەوەی کە بیکاتە ناو هەگبەی خەڵکانیترەوە، ئەگەر بەوکەسانە بگوترێت سەفیهو بێ ئەقڵ ئەوا زۆریان پێخۆش دەبێت و لەبەر کەم ئەقڵییەکەیان شانازی پێوە دەکەن.

***سەفیهو بێئەقڵ قسەم لەگەڵدا دەکات بە هەموو شێوەیەکی ناشیرین***

***منیش پێمناخۆشە کە وەڵامیدەمەوە***

***ئەو سەفیهی و بێئەقڵییەکەی خۆی زیاتر دەکات و منیش هێندەیتر بەسەبرو***

***خۆڕاگرتر دەبم***

***هەروەك عودێك کە تاوەکو زیاتر بسوتێت بۆنخۆشی زیاتر دەداتەوە*** [80].

# نێوان خۆت و خوداکەت چاکبکە...

لەتەنیشت شافیعیەوە دوو پیاو دانیشتن و ڕەخنەیان لە شافیعی دەگرت و ئەویش گوێی بۆ گرتبوون.

---

[80] حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٢٣.

شافیعی بەیەکێکیانی گوت: تۆ ناتوانیت کە هەموو خەڵکی لەخۆت ڕازی بکەیت، هەربۆیە پێویستە هەوڵی ئەوە بدەیت کە نێوان خۆت و خودای گەورە چاکبکەیت، ئەگەر نێوان خۆت و خودای گەورەت چاککرد، ئەوا ئیتر خەمی ڕەزامەندی خەڵکیت نەبێت[٨١].

# مونازەرەیەك لەبارەی ئەبی حەنیفە و ئیمامی مالیکەوە...

ڕۆژێکیان شافیعی لەگەڵ محمدی کوڕی حەسەندا دانیشتبوو، سەرقاڵی قسەو گفتوگۆی جۆراو جۆر بوون.

محمدی کوڕی حەسەن گوتی: ئەبوحەنیفەی هاوەڵی ئێمە لە مالیکی هاوەڵی ئێوە شارەزاترو زاناترە.

شافیعیش گوتی: مەبەست خۆ هەڵکێشان و گەورە گرتنە یان وویژدانە؟

محمدی کوڕی حەسەنیش گوتی: وویژدان.

شافیعی گوتی: باشە بەڵگەتان چیە لەسەر ئەوە؟

محمدی کوڕی حەسەنیش گوتی: کیتاب و سوننە و ئیجماع و قیاس.

شافیعی گوتی: خودا چاکت بۆ بکات، ئایا هاوەڵی ئێمە(واتە ئیمامی مالیك) شارەزاترە لە کتێبەکەی خودا یان هاوەڵەکەی ئێوە(واتە ئەبو حەنیفە)؟

محمدی کوڕی حەسەنیش گوتی: مادەم خودات کردە شاهێد بەسەرمەوە، دەبێت بڵێم هاوەڵەکەی ئێوە!

---

[٨١] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٩٨ – ١٩٩ .

شافیعی گوتی: مالیکی هاوەڵی ئێمە شارەزاترە لەبارەی سوننەتی پێغەمبەری خوداوە یان ئەبو حەنیفەی هاوەڵی ئێوە؟

محمدی کوڕی حەسەن گوتی: مالیکی هاوەڵی ئێوە.

شافیعیش گوتی: بێجگە لە قیاس شتێکیتر ماوەتەوە؟

محمدی کوڕی حەسەن گوتی: نەخێر.

شافیعی گوتی: ئێمە زۆر لە ئێوە زیاتر بانگەشەی کارکردن بە قیاس دەکەین، لەسەر بنەماکانیش قیاس دەکرێت، باشە ئیتر کێ قیاس نازانێت[٨٢]؟

## ئیمان قسەو کردارە...

پیاوێك لە شاری بەڵخەوە هات بۆ میسر، چوو بۆ لای ئیمامی شافیعی و لەبەردەمیدا دانیشت و لەبارەی ئیمانەوە پرسیاری لێکرد.

شافیعی بە پیاوەکەی گوت: تۆ لەبارەی ئیمانەوە چی دەڵێیت؟

پیاوەکەیش گوتی: ئیمان تەنها قسەیە.

شافیعی گوتی: ئەمەت لە کوێوە هێنا؟

پیاوەکەیش گوتی: لەو ئایەتەی خودای گەورەوە کە لە قورئاندا دەفەرمێت (ان الذین امنو وعملوا الصالحات)[٨٣] خودای گەورە بە واوێك ئیمان و کرداری لەیەکتری جیاکردووەتەوە، هەربۆیە ئیمان قسەیەو کرداریش شەریعەتەکانن.

شافیعیش گوتی: ئەگەر قسەکەی تۆ ڕاستبێت کە واو جیاکەرەوە بێت ئەوکات تۆ دوو خودا دەپەرستیت، واتە خودایەك لە خۆرهەڵات و خودایەکیش لە خۆرئاوا، (رب المشرقین ورب المغربین)[٨٤].

[٨٢] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ١٨٤.

[٨٣] سورەتی البقره ئایەتی ٢٧٧ .

پیاوەکەیش بە تورەییەوە گوتی: پاکوبێگەردی بۆ خودا منت کردە بت پەرست.

شافیعیش گوتی: بەڵکو تۆ خۆت خۆتت کردە بت پەرست.

پیاوەکەیش کاتێك هەڵەکەی خۆی بینی گوتی: داوای لێخۆشبوون لەخودا دەکەم لەوەی کە گوتم، تەنها یەك خودایش دەپەرستم، دەڵێم: ئیمان قسەو کردارە.

ئەوەبوو پیاوەکە پارەیەکی زۆری دایە شافیعی بۆ ئەوەی بیبەخشێتەوە، بەئیمان و باوەڕێکی دامەزراوەوە میسری بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ ناوچەکەی خۆی[٨٥].

## شافیعی وەك خۆرە...

عبداللەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل جلوبەرگی ڕازاوەی ویقارو ئەدەبی پۆشیبوو، هات بۆلای ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی باوکی، کە سەرقاڵی هەندێك مەسەلەی زانستی بوو.

بە هێمنی و خۆشەویستی کەسێکی عەودااڵەوە گوتی: باوکە گیان کامە پیاو شافیعیە؟ دەبینم تۆ دوعای بەخێری زۆری بۆ دەکەیت.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش کە بیرەوەرییەکانی بۆنخۆش بوبون بە بەرامەی خۆشی یادەوەرییەکان گوتی: کوڕی شیرینم شافیعی وەك خۆر وابوو بۆ دوونیا، وەك تەندروستیش وابوو بۆ خەڵکی، سەیرکە و بزانە هیچ شتێك دەتوانێت جێگەی ئەم دوو شتە بگرێتەوە[٨٦]؟!

---

[٨٤] سورەتی الرحمان ئایەتی ١٧ .

[٨٥] حلية الاولياء ب ٩ لا ١١٠ .

[٨٦] صفة الصفوة لابن الجوزی ب ٢ لا ٤٦٤ .

# شافیعی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل...

بە عیزەتی زانایانەوە شافیعی چوو بۆلای ئەمیری ئیمانداران هارونە ڕەشید.

باسی خراپی بارودۆخە یەمەنی بۆ دەکردو گوتی: من یەمەنم بەجێهێشت کە هەریکبوو بفەوتێت و پێویستی بە فەرمانڕەوایەکی باش هەیە.

هارونیش بە متمانە بە ئیمامی شافیعی گوتی: تۆ پیاوێکمان بۆ دیاریبکە بۆ ئەوەی بیکەینە دادوەری ئەوێ، دواتر شافیعی لەناو کۆڕو مەجلیسەکەی سوڵتان دەرچوو لەناو ئەڵقەی وانەکانیدا دانیشت، دەبینێت ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەوێیە کە یەکێکبوو لە قوتابیە هەرە باشەکانی.

شافیعی بە ئەحمەدی گوت: من قسەم لەگەڵ ئەمیری ئیمانداراندا کردووە کە دادوەرێك بۆ یەمەن دابنێت، ڕایسپاردوم کە من کەسێك بۆ ئەو پۆستە دیاریبکەم، منیش تۆم هەڵبژاردویت، هەربۆیە بڕۆو خۆت ئامادە بکە بۆ ئەوەی بتبەم بۆلای ئەمیری ئیمانداران و ئەو پۆستەت پێبسپێرێت.

ئەحمەدیش بەو پەڕی ئەدەب و داوای لێبوردنەوە گوتی: من بۆ ئەوە هاتوم بۆلات کە زانست و زانیاریت لێوە فێر ببم، ئایا فەرمانم پێدەکەیت کە ببمە دادوەرو واز لە بەدەستهێنانی زانست بهێنم؟!

شافیعی زۆر شەرمی لە قسەکەی ئەحمەد کرد و بێدەنگبوو[٨٧].

[٨٧] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ١٥٤.

## شافیعی پیاوێکە کە هاوشێوەی ئەوت نەبینیوە...

لە شاری مەککەی پیرۆزدا ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەناو ئەڵقەی وانە ووتنەوەکان و باخچەکانی زانستدا پیاسەیان دەکردو هەموو شتێکی بەنرخ و جوانیان کۆ دەکردەوە.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بە ڕوویەکی گەشاوەوە گوتی: وەرە با پیاوێکت نیشان بدەم کە تاوەکو ئێستە چاوەکانت کەسێکی لەو شێوەیان نەبینیوە.

ئیبن ڕاهویە دەڵێت: ئیمامی شافیعی نیشاندام[88].

## وەرع و خۆپارێزی شافیعی....

ڕۆژێکیان شافیعی بە هاوڕێیەتی حاریسی کوڕی سورەیج ڕۆیشتن تاوەکو چوونە لای خومەتکارێکەی هارونە ڕەشید، لە ماڵی فەرش لە دیباج.

کاتێك شافیعی پێی خستە ئەودیوی دەرگای ماڵەکەوە، دەبینێت فەرش ڕێژکراوە بە ئاوریشم، هەربۆیە گەڕایەوە و نەچوویە ژورەوە.

خزمەتکارەکەیش بە شافیعی گوت: بڕۆرە ژوورەوە.

شافیعیش کە یەك تۆپەڵە لە وەرع و خۆپارێزی بوو گوتی: حەلاڵ نیە ئەمانە ڕابخرێن.

خزمەتکارەکەیش زۆر سەرسام بوو بە وەرعی شافیعی و زەردەخەنەیەکی کرد، دواتر ڕێگەی ژورێکیتری نیشاندان کە بە ئاوریشم فەرش ڕێژ نەکرابوو.

---

[88] صفة الصفوة ب ٢ لا ٤٦٤ .

شافیعی لەگەڵ خزمەتکارەکەدا چوویە ژوورەوە و پێی گوت: ئەمەیان حەڵاڵە بەڵام ئەویتریان حەرام بوو، ئەمەیان بەنرخترە لەویتر بۆ مرۆڤ، خزمەتکارەکە زەردەخەنەیەکی کرد و هیچی نەگوت[89]...

## شافیعی وولاخەکەی دەکاتە دیاری....

ڕۆژێکیان شافیعی هات بۆماڵی عبداللەی کوڕی حەکەم.

بە محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی حەکەمی گوت: سواری ئەم وولاخەی من ببە، ئەویش سواری بوو.

شافیعی گوتی: بەرەو پێشەوە بڕۆو بەرەو دواوە بگەڕێرەوە.

محمدیش بەوپەڕی نەرم و نیانی جوانیەوە بەرودوای بە وولاخەکە دەکرد.

شافیعیش کە بەخشندەترینی خەڵکی بوو گوتی: ئەم وولاخەی منت زۆر جوان لێدێت و بەسەریەوە زۆر پێکەوتەیت، وەك دیاری لێمی وەربگرە و بیبە بۆ خۆت[90].

## ئەوە برای تۆیە....

ڕەبیعی کوڕی سولەیمان لەخزمەتی ئیمامی شافیعیدا دانیشتبوو دڵ و دەرونی بە زانست و قسە پاراوەکانی شافیعی ڕووناکدەکردەوە، لەوکاتەدا کە ئەم گوێی بۆ شەیخەکەی خۆی گرتبوو برایەکی ڕەبیع هات کە ناوی وەکیع بوو، پێشتر شافیعی نەیبینیبوو.

کاتێك وەکیعی کوڕی سولەیمانی برای ڕەبیع هاتە پێشەوەو لەناو مەجلیس و کۆڕی وانەکەی شافیعیدا دانیشت و لەدوورەوە چاوی پێی کەوت.

---

[89] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٦٥ . حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٢٦ .

[90] مناقب الشافعی للرازی لا ١٢٨ .

بە زیرەکی و فەراسەتی خۆی گوتی: ئەی ڕەبیع ئەوە برای تۆ نیە؟

ڕەبیعیش گوتی: بەڵێ خودای گەورە چاکت بۆ بکات[٩١]...

## شافیعی و تورەکەی دینارەکان...

ڕەبیعی کوڕی سولەیمان ژنی هێناو هات بۆلای ئیمامی شافیعی و بە شەرم و خەجاڵەتیەکەوە گوتی: ژنم هێناوە.

شافیعی گوتی: چەندە مارەییت داوە؟

ڕەبیعیش گوتی: سیی دینار.

شافیعی گوتی: چەندەت بە حازر پێداوە؟

ڕەبیع گوتی: شەش دینار.

شافیعی خانویەکی بەرزی هەبوو کە بەقادرمە دەچوویە ژورەوە، سەرکەوت و چوویە ماڵەکەیەوەو تورەکەیەکی هێنا بیست و چوار دیناری تێدا بوو، بەدیاری بەخشی بە ڕەبیع بۆ ئەوەی هەموو مارەییەکە بدات بە ژنەکەی[٩٢].

## شافیعی و پزیشکەکەی میسر...

لە وولاتی میسردا ئیمام محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی لەگەڵ کۆمەڵێک پزیشکی شارەزاو بلیمەتدا دانیشت و قسەو باسی پزشکی لەگەڵدا دەکردن، تاوەکو دەمووچاوی پزیشکەکان گەشایەوە لەو هەموو شارەزایی و زانیارییەی ئیمامی شافیعی لەبارەی زانستی پزیشکیەوە کە هەیبوو.

---

[٩١] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٣٢ .

[٩٢] حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٣٢ .

یەکێك لە پزیشکەکان گوتی: شافیعی هێندە بە شارەزاییەوە باسی زانستی پزیشکی دەکرد وامزانی یەکێك لە پزیشکە بەتواناکانی عێراق هاتووە بۆلامان.

پزیشکەکە بە شافیعی گوت: هەندێك شتت لە کتێبەکانی بوقرات بۆ بخوێنمەوە؟

شافیعیش بە زەردەخەنەیەکەوە ئاماژەی کرد بەرەو مزگەوتەکە و قوتابیەکانی ناوی و گوتی: لەبەر ئەوانە ناتوانم زۆر لەلاتان بمێنمەوە، داوای لێبوردنتان لێدەکەم دەبێت برۆم[٩٣].

## شافیعی بە سەد دینارەوە دەگەرێتەوە...

رۆژێکیان هەرسەمە هات بۆلای ئیمامی شافیعی سلاوی هارونە رەشیدی ئەمیری ئیماندارانی پێراگەیاند.

دواتر بە دڵخۆشییەکەوە پێی گوت: ئەمیری ئیمانداران فەرمانیکردووە کە پێنج هەزار دینارت وەك بەخشیش پێبدرێت.

دواتر هەرسەمە پارەکەی دایە دەستی ئیمامی شافیعی.

کاتێك شافیعی دینارەکانی وەرگرت ناردی بەشوێن سەرتاش و کەڵەشاخ گرێکدا و پەنجا دیناری پێدا.

دواتر دینارەکانی دەکردە تورەکەی بچوکەوە و دابەشی دەکرد بەسەر قورەیشیەکاندا کە لەناو کەعبەو لەشاری مەککەدا بوون، تاوەکو کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە تەنها سەد دیناری پێمابوو[٩٤].

---

[٩٣] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٢٤ .

[٩٤] سیر اعلام النبلاء ب ١٠ لا ٣٨ .

# شافیعی و کتێبەکانی...

شەوداهات و تاریکایی باڵیکێشا بەسەر هەموو شوێنێکدا، ماڵەکان بەناو تاریکیەکی ئەنگوستەچاودا ڕۆچوون.

شافیعیش بەسەر پشتدا پاڵکەوت و ڕاکشا، چوویە خەوێکی قوڵەوە، لەخەونیدا بینی کە پیاوێك هاتوو کتێبەکانی برد و بەناو هەوادا بلاویکردنەوە و هەروەك باڵندە دایان لە شەقەی باڵ و فڕین.

کاتێك خەبەری بوویە چووبۆلای یەکێك لە خەونزانەکان و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە.

گوتی: بەپێی ئەو خەوەی کە تۆ بینیوتە هیچ وولاتێکی ئیسلامی نامێنێت کە زانستەکەی تۆ نەچێتە ناویەوە[95].

# بەخششی شافیعی...

شافیعی خۆی بە جوانترین خشڵ و زێرەکانی بەخشندەیی ڕازاندبوویەوە، کاروکردارەکانی وەك عەترو بۆنخۆشی وابوون، هەرکاتێك دەجولایەوە بۆنێکی خۆشیان بەدەوری خۆیاندا بلاو دەکردەوە.

ڕۆژێکیان کاتێك ئیمامی شافیعی بەڕێگادا دەڕۆیشت، پیاوێك پارچە قوماشێکی پێدا کە لەسەری نوسرابوو من هاوسەرگیریمکردووە و هاوکاریم بکە.

شافیعی بە ڕەبیع دەڵێت: ئەی ڕەبیع سیی دیناری پێبدە.

ڕەبیعیش دەڵێت: خودا چاکت بۆبکات ئەم پیاوە دە دیرهەمی بەس بوو.

[95] مناقب الشافعی للبیهقی ب ۱ لا ۲۵۹ .

شافیعی دەڵێت: هاوار بەماڵت هێشتا سیی دیناریش کەمە باشە چی لێبکات؟ بیدات بە فلانە شت یان لەفلانە شتدا خەرجی بکات؟

دواتر شافیعی هاواریکرد بەسەر ڕەبیعدا و گوتی: ئەوپارەیەی کە پێمگوتیت بیدە بەو پیاوە.

ئەوە بوو ڕەبیعیش سیی دیناری پێدا[٩٦].

# شافیعی و قەیصەرو هیرقل...

محمدی کوڕی عبداللەی کوڕی حەکەم لەگەڵ عبدالحەکەمی برایدا لەناو قولاییەکانی ژیان و سیرەی پێغەمبەردا دانیشتن و گوێکانیان بە ژیان و سیرەی پیرۆزی پێغەمبەری ئازیز(ص) بۆنخۆش دەکرد.

یەکێکیان گوتی: پێغەمبەر کاتێ مرد کە سەروەت و سامانی پاشای ڕۆم (قەیصەر)ی گرتبوو.

ئەویتریشیان گوتی: نەخێر پێغەمبەر کاتێك مرد سەروەت و سامانی پاشای ڕۆمەکان (هیرقل)ی گرتبوو.

بوویە دەمەقاڵێیان و چوون بۆلای شافیعی بۆ ئەوەی داوەریان لەنێواندا بکات، هاتن بۆ لای و باسی مەسەلەکەیان بۆکرد.

شافیعی گوتی: هەردوکتان پێکاوتانەو هاوڕابوون لەسەر ئەوەی کە قەیصەر نازناوی پاشایەکە هەروەك دەڵێن: ئەمیری ئیمانداران، هەروەها هیرقلیش ناوی پاشای ڕۆمە هەروەك دەڵێن: هارونە ڕەشید[٩٧].

---

[٩٦] سير اعلام النبلاء ب ١٠ لا ٣٨ .

[٩٧] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٤٩٤ .

# بەگەورەگرتنی قسەی پێغەمبەر لەلایەن شافیعیەوە...

پیاوێك لە وولاتی میسر لەبارەی مەسەلەیەكەوە پرسیاری لە ئیمامی شافیعی كرد، ئەویش فتوای بۆدەركرد.

گوتی: پێغەمبەر فەرموویەتی بەوجۆرە و بەو جۆرەیە.

پیاوەكە گوتی: هەر لەخۆتەوە وا دەڵێیت؟

شافیعیش تورەبوو گوتی: ئەی نابینت هەروەك زانا گاورەكان پشتوێنێكی گەورەم بەستووە بە ناوقەدمەوە؟

هەروەها نابینیت خەریكم لە كەنیسە دێمە دەرەوە(ئەمانەی وەك تانە گوت بەرامبەر بە پرسیارە بێماناكەی پیاوەكە).

بەلأم هێشتا تۆ دەڵێیت: ئەم قسانە لە خۆتەوە دەكەیت؟!

من قسەی پێغەمبەری خودات بۆ دەگێڕمەوە و هەرلەخۆمەوە قسە ناكەم[٩٨].

ڕۆژێكیان پیاوێك لەبارەی مەسەلەیەكەوە پرسیاری لە شافیعی كرد، ئەویش لەوەلأمدا گوتی: پێغەمبەر لەوبارەیەوە فلأنە شت و فلأنە شتی فەرمووە.

كابرای پرسیاركەریش گوتی: ئەی باوكی عبدالله ئەمە بۆچوونی خۆتە؟

شافیعیش زۆر تورەبوو ڕەنگی زەردو سور هەڵگەڕاو بە كابرای پرسیاركەری گوت: هاوار بەماڵت بۆ كامە سەرزەویم دەبەیت؟ ئاسمانی چ شوێنێك دەدەیت بەسەرمدا؟ ئەگەر شتێك لە پێغەمبەرەوە بگێڕمەوەو هەركەسێك بەپێچەوانەیەوە بجوڵێتەوە هەرگیز پێی ناڵێم بەسەر سەرو سەرچاوان... بەسەر سەرو سەرچاوان،

---

[٩٨] حلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٠٦ .

بەڵکو زۆر بەتوندی پێی دەڵێم کارەکەت یان قسەکەت دژی فەرمودەو کردارەکانی پێغەمبەری خودایە(ص)[99].

## ئەدەب و ڕەوشتی شافیعی لەگەڵ زانایاندا...

پیاوێك هات و پرسیارێکی لە شافیعی کردو گوتی: سوێندم خواردووە کە بە پێ بچم بۆ مەککە بەڵام سوێنەکەم خستووە؟

شافیعیش گوتی: دەبێت کەفارەتی سوێنەکەت بدەیت.

پیاوەکەیش گوتی: ئەی باوکی عبدالله ئەمە بیرو بۆچونی خۆتە؟!

شافیعیش بە ئەدەب و خۆشکێنیەکەوە گوتی: ئەمەی قسەی کەسێکی زۆر باشترە لە من.

پیاوەکەیش گوتی: ئەوکەسە کێیە؟

شافیعیش گوتی: عەتای کوڕی ئیبن ڕەباحە[100].

## شافیعی بەجوانی وەڵام دەداتەوە....

بەوپەڕی خۆشکێنیەوە شافیعی سورای گوێدرێژەکەی بوو، بەخێراییەوە ڕۆیشت تاوەکو گەیشتە بازاڕی پێڵاو فرۆشەکان، نەقیزەی گوێدرێژەکە بەدەستیەوە کەوتە خوارەوە، شاگردی یەکێك لە دووکانە پێڵاوفرۆشەکان هەڵیگرت و تەکاندی و دایەوە دەستی، شافیعیش زۆر سوپاسی کرد و ڕێزو خۆشویستیەکی زۆری خۆی بۆ دەربڕی.

---

[99] حلية الاولياء ب ٩ لا ١٠٦ .

[100] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٥٠١ .

شافیعی بە زمانێکی پاراوو وەلآمێکی شیرینەوە بە خزکمەتکارەکەی گوت: برۆو ئەم دینارانە بدە بە شاگردی ئەو دووکانە پێلاو فرۆشە.

خزمەتکارەکەیش هەرچییەك دیناری پێبوو بردی و دایبە شاگردی دووکانی پێلآوفرۆشەکە.

ڕەبیعی کوڕی سولەیمان دەڵێت: نازانم چەند بوون نۆ دینار یان حەوت دینار بوون[١٠١].

## شافیعی بەرگری لە حەدیسەکانی پێغەمبەری خودا دەکات...

ڕۆژێکیان حەفصی فەرد هات بۆلای ئیمامی شافیعی بۆ ئەوەی ڕەخنە لە هەندێك حەدیس بگرێت و هێرشبکاتە سەریان.

بە دەنگێکی سوکایەتیەوە گوتی: ئەی باوکی عبدالله ئێوە دەڵێن: هەر حەدیسێك لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتکرابێت بەدڵنیاییەوە سودێکی هەیە، باشە سود و قازانجی ئەو حەدیسە چیە کە پێغەمبەر چووەتە حەوشەی هۆزێکەوە و بەپێوە میزی کردووە؟!

شافیعیش گوتی: بەڵکو گەورەترین سودی تێدایە، ئەی نازانیت کە عەرەب دەڵێن: ئەگەر پیاوێك پشت ئێشەی لەگەڵدا بوو ئەوا میزکردن بۆ ئەو کەسە بەپێوە دەبێتەهۆی ئەوەی کە چاکبێتەوە؟ پێغەمبەریش لەبەر ئەو هۆکارە ئەوکارەی کردووە[١٠٢]!!

---

[١٠١] مناقب الشافعی للرازی لا ١٢٨ . سیر اعلام النبلاء ب ١٠ لا ٣٧ .

[١٠٢] مناقب الشافعی للرازی لا ٣٠٥ .

# ترسی شافیعی لە هەیبەتی ئیمامی مالیك...

شافیعی هەروەك ترس و شەرمی مندالآن بەرامبەر بە مامۆستاکەیان لە کۆڕی وانەکانی ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەسی مامۆستایدا دادەنیشت.

شافیعی خۆی بۆماندەگێڕێتەوە و دەڵێت: چوومە شاری مەدینەوە و دەبینم مالیکی کوڕی ئەنەس خاوەنی شانو شکۆو هەیبەتێکی زۆر بێوێنەی زانستیە، منیش هێندە ڕیزو قەدرم لەو هەیبەتە دەگرت و شەرمم لەو پیاوە مەزنە دەکرد، ئەگەر لەیەکێك لە وانەکانیدا ئامادە بومایا و بمویستایا کاغەزەکەی بەردەستم هەڵبدەمەوە ئەوا زۆر بەهێمنی و نەرمونیانیەوە ئەوکارەم دەکرد لەبەر زۆری شەرم و هەیبەتی ئەو پیاوە لەدڵمدا کە مەبادا بەدەنگی کاغەزەکام سەرنجی ڕابکێشم و سەرقاڵی بکەم[١٠٣].

# شافیعی دەگری....

بەدڵانێکی پاکوبێگەردەوە، هاوەڵانی شافیعی دانیشتن و باسی پیاوچاکان و زاهیدە گەورەکانیان دەکرد، لەوکاتەی کە ئەوان بە زمان و گێڕانەوەکانیان بەناو سیرەو ژیاننامەی ئەو پیاوە مەزنانەدا ڕۆچووبون، عەمری کوڕی نەباتە هات بۆلایان و گوتی: ئەوە باسی چی دەکەن؟

گوتیان: باسی پیاوە زاهیدەکانمام دەکرد تاوەکو گەیشتینە سەر (زوالنون).

ئەویش گوتی: سوێند بەخودا پیاوێکم نەبینیوە کە هێندەی محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی زمانپاراوترو خاوەن وەرعتر بێت، جارێکیان من و ئەوو حاریسی کوڕی لوبەید چووین بۆ صەفا، حاریس کە خزمەتکاری صاڵحی مەری بوو

[١٠٣] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ١٤٤ .

دەستیکردە قورئان خوێندن و ئەم ئایەتەی خوێند (ئەمە ڕۆژی فەسڵانە کە ئێوەو هەموو پێشینانتان بەیەکەوە کۆ دەکەینەوە)[١٠٤] دەبینم شافیعی شڵەژاو زۆر گریا.

دواتر بە دەنگێکی گریاناویەوە گوتی: خودایا من پەنات پێدەگرم لە پلەو مەقامی درۆزنان و پشتهەڵکردنی بیئاگایان لە بەرنامەکەی تۆ، خودایا ئەی ئەوکەسەی کە دڵی عاریفەکان ملکەچ بووە بۆت و دڵی عاشیقەکانیش عەودالّ و سەودا سەری تۆیە، خودایا بەخشندەیی خۆتم پێببەخشە و بە پەردەی ڕێزو گەورەیی خۆت ڕێزم پێببەخشە، لەبەر بەخشندەیی خۆت لێمخۆشبە، ئەی بەسۆزترینی بەسۆزو میهرەبانەکان[١٠٥].

## خۆشەویستی شافیعی بۆ زانست و ئەدەب...

ڕۆژێکیان لەبارەی زانست و ئەدەبەوە پرسیاریان لە ئیمامی شافیعی کرد.

پێیانگوت: حەزت چۆنە بەرامبەر بە ئەدەب؟

ئەویش گوتی: ئەوەی کە نەمبیستووە گوێی بۆ دەگرم، هەربۆیە هەموو ئەندامەکانی جەستەم دەبنە گوێ و هەروەك گوێی ڕاستەقینە چێژی لێوەردەگرن.

پێیانگوت: ئەی سوربونت چۆنە لەسەری؟

ئەویش گوتی: هەروەك کەسێکە کە زۆر حەزی لەپارەیەو چێژ لە کۆکردنەوەی دەبات.

پێیانگوت: ئەی چۆن بەشوێنیدا دەگەڕێت و بەدەستی دەهێنیت؟

---

[١٠٤] سورەتی المرسلات ئایەتی ٣٨ .

[١٠٥] مناقب الشافعی للرازی لا ٣١١ .

گوتی: هەروەك ئەو ژنەی کە هیچکەسێکی نیە و تەنها یەك منداڵی هەیە و وونیکردووە و بەوپەڕی عەوداڵی و تاسەوە بەشوێنیدا دەگەڕێت[١٠٦].

## شافیعی و شەیخەکە...

ئیمامی شافیعی لەگەڵ کۆمەڵێك لە قوتابیانی زانستدا دانیشت و گەوهەرو مرواری لەزاری دەهاتە خوارەوەو بڵاوی دەکردەوە.

لەوکاتەی کە ئەو دڵەکانی بە قسە شیرینەکانی بەختەوەر دەکرد، شەیخێکی خاوەن هەیبەت و ویقار هات بۆلای و لەلای شافیعی دانیشت، شافیعیش بەوپەڕی ڕێزو ئیحتیرامەوە سەیری دەکرد.

شەیخەکە بە ویقارو دەنگێکی نزمەوە گوتی: پرسیار بکەم؟

شافیعی گوتی: بپرسە.

شەیخەکە گوتی: بەڵگە چیە لەناو ئاینی خوادا؟

شافیعی گوتی: کتێبەکەی خودا.

شەیخەکە گوتی: باشە ئەی چیتر؟

شافیعی گوتی: سوننەتی پێغەمبەری خودا.

شەیخەکەیش گوتی: ئەی چی تر؟

شافیعیش گوتی: کۆدەنگی و ئیجماعی زانایان.

شەیخەکەیش گوتی: باشە ئەم کۆدەنگیەی زانایانی ئوممەتت لەکوێوە هێنا؟

شافیعی نزیکە سەعاتێك بەناو بیرو خەیاڵدا ڕۆچوو، زۆر بیری لێدەکردەوە.

---

[١٠٦] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ١٤٣ – ١٤٤.

شەیخەکەیش بەدەنگێکی هێمن و لەسەرخۆوە گوتی: سێ ڕۆژ مۆڵەتت پێدەدەم تاوەکو بەباشی بیری لێبکەیتەوە، ئەگەر لە کتێبەکەی خودا بەڵگەیەکت لەسەر قسەکەت هێنا ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر بەڵگەت نەهێنا ئەوە پێویستە تەوبە بکەیت.

ڕەنگی شافیعی گۆڕدراو هەستا ڕۆیشت، چوویە ماڵەوە و تاوەکو سێیەم ڕۆژە نەهاتە دەرەوە، لەپاشان لەنێوان نیوەڕۆو عەسردا هاتە دەرەوە، زۆر ڕوی خۆشبوو، هەروەك نەریتی خۆی دانیشت، یەکسەر شەیخەکەیش هات و دانیشت.

گوتی: ئادەی بزانم داواکارییەکەم چی لێهات؟

شافیعیش گوتی: بەڵێ، اعوذ بالله من الشيطان الرجيم خودای گەورە دەفەرمێت (ئەوەی کە تەنگ بە پێغەمبەر هەڵبچنێك لەپاش ئەوەی کە هیدایەت و ڕێنمایی بۆ ڕوونبویەوە و شوێنی ڕێگەیەکیتری جیاواز لە ڕێگەی ئیمانداران بکەوێت هەروەك چۆن پشتی لێهەڵکردوین ئاوا ئێمەیش پشتی لێهەڵدەکەین و دەیگەیەنین بە دۆزەخ کە خراپترین چارەنوسە)[107].

شافیعی گوتی: کاتێك مرۆڤ لەدژی کۆدەنگی زانایانی ئیمانداران دەجولێتەوە ئەوا دۆزەخ فەرزە بۆ ئەوەی بچێتە ناویەوە، هەربۆیە بەپێی ئەم ئایەتەی قورئان کۆدەنگی زانایانی ئوممەت دەبێتە بەڵگە.

شەیخەکەیش بەدڵخۆشیەوە گوتی: بەڵێ زۆر ڕاستە.

دواتر هەستاو ڕۆیشت.

شافیعی گوتی: هەموو شەوو ڕۆژێکی ئەو سێ ڕۆژەی کە شەیخەکە مۆڵەتی پێدابووم سێجار قورئانم دەخوێند، تاوەکو ئەو بەڵگەیەم دۆزیەوە[108].

---

[107] سورەتی النساء ئایەتی ١١٥ .

[108] سیر اعلام النبلاء ب ١٠ لا ٨٣ .

# بەخشینی ئیمامی شافیعی...

شافیعی زۆر بەخشندە بوو بەجۆرێك دەیبەخشی کە بەهیچ شێوەیەك لە هەژاری نەدەترسا.

موزەنی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: پیاوێکم نەبینیوە هێندەی شافیعی بەخشندە بێت، شەوی جەژن بەیەکەوە لە مزگەوت هاتینە دەرەوە، من باسی مەسەلەیەکم لەگەڵدا دەکرد تاوەکو گەیشتینە بەردەم دەرگایماڵەوەیان، خوڵامێك تورەکەیەکی بچووك پارەی بۆ هێنا.

گوتی: گەورەم سڵاوی هەبوو بۆت و گوتی: ئەم کیسە وەربگرێت.

شافیعیش کیسە پارەکەی لە خوڵامەکە وەرگرت و خستیە ناو گیرفانیەوە، پیاوێك لەناو کۆڕی وانەکانیدا هات بۆلای.

بە دەنگێکەوە کە هەژاری و نەداری لاوازی کردبوو گوتی: ئەی باوکی عبدالله ئێستە ژنەکەم منداڵی بووە و منیش هیچم نیە. شافیعیش بەوپەڕی دڵخۆشی و بەختەوەرییەوە کیسە پارەکەی دایە پیاوەکە و چوویەوە ماڵەوە و هیچی پێنەبوو[١٠٤].

# زیرەکی شافیعی...

شافیعی لەگەڵ خوڵامەکەیدا چوو بۆ وولاتی یەمەن بەمەبەستی بەدەستهێنانی زانست و زانیاری، لەرێگەدا دایان بەلای پیاوێکدا کە لەبەردەم ماڵەکەیدا دانیشتبوو، شافیعی سەیری کردو دەبینێت پیاوەکە زۆر لەوە پیسترە کە ئەم چاوەڕێی دەکرد، ئەمەش لەرێگەی ڕیساکانی فیراسەتەوە بۆ دەرکەوت.

---

[١٠٤] حیلیة الاولیاء ب ٩ لا ١٣٢.

شافیعیش بەناچارییەوە پێی گوت: خانوویەك هەیە؟

پیاوەکەیش گوتی: بەڵێ.

ئەوەبوو ماڵی پێدان و ڕێزی لێگرتن، نانی ئیوارەو بۆنخۆشی بۆناردن، ئالیکیشی دایە وولاخەکانیان، ڕاخەر و لێفەی پێدان، کابرا هەموو ئەمانەی کرد و شافیعیش زۆر سەری سوڕ دەما، چوونکە بەپێی فیراسەتی ئەم پیاوەکە پیسترین کەس بوو!

بۆ بەیانیەکەی شافیعی سوپاسی پیاوەکەی کرد، پێش ئەوەی بڕوات ڕوویکردە پیاوەکە و گوتی: ئەگەر هاتیت بۆ مەککە و نزیکی زی تیوا بوویتەوە، ئەوا پرسیاری ماڵی محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی بکە.

وویستی پاداشتی چاکەکەی بداتەوە، بەڵام پیاوەکە لە پیسی و فێڵباوزیەوە یەکسەر بە شافیعی گوت: تۆ بەندەی باوکی خۆتی؟

شافیعی گوتی: نەخێر.

کابرایش گوتی: ئەی هیچ نیعمەتێکی تۆ لەلای من هەیە؟

شافیعیش بەسەرسامیەوە گوتی: نەخێر.

پیاوەکەیش کە پیسی و چەپەڵی خۆی ئاشکرا کرد گوتی: ئەی باشە کرێی ئەو هەموو خەرجەی کە لەدوێنێوە بۆم کردوون کوانێ؟!

شافیعیش کە گومانەکەی ڕاستدەرچوبوو گوتی: کرێکەت چەندە؟

پیاوەکەیش دەستیکردە حیسابکردنی ئەوەی کە سەرفی کردبوو گوتی: خۆراك و پێخۆرم بە دوو دیرهەم بۆ کڕیویت، بۆنخۆشیەکەیش بە سێ دیرهەم، ئالیکی وولاخەکانتان بە دوو دیرهەم، کرێی ڕاخەرو لێفەکەیشتان بە دوو دیرهەم.

شافیعیش بە خولامەکەی گوت: کرێکەی پێبدە.

دواتر ڕوویکردە پیاوەکە و زەردەخەنەیەکی کرد و بە ڕەزامەندی و بەختەوەرییەوە لەوەی کە فیراسەتەکەی ڕاستدەرچووبو گوتی: ئایا هیچیتر ماوە؟

پیاوەکەیش بە ڕەقیەوە گوتی: نەخێر، دەی بڕۆن خودا سەرشۆڕت بکات، کەسی خراپی وەك تۆم نەبینیوە[110]!!

## شافیعی و کوڕە گەنجەکە....

بەشەرمێکەوە گەنجێك هات بۆلای ئیمامی شافیعی و پارچە کتێبێکی لەدەستیدا بوو کە شتێکی بۆ شافیعی تێدا نوسرابوو.

ڕەبیعی کوڕی سولەیمانی قوتابی شافیعی کە لەتەنیشتیەوە دانیشتبوو بەچاوی خۆی ڕووداوەکەی دەبینی گوتی: سوێند بەخودا نابێت ئەمەم لەدەستدەربچێت، ئەوەبوو پارچە کتێبەکەی لە گەنجەکە وەرگرت و دەبینێت تێیدا نوسراوە:

پرسیار لە زانای مەککەیی بکە ئایا گوناهو تاوانە کە مرۆڤ هاوسەری خۆی لەباوەش بگرێت و ماچی بکات؟

شافیعیش لەوەڵامەکەیدا گوتی:

پەنا دەگرم بە خودا کە بەهۆی دەستبازی و ماچکردنەوە لەخودا ترسان و خودا پەرستی مرۆڤ خەوشدار ببێت.

ڕەبیعی کوڕی سولەیمان ئەوەی زۆر پێناخۆش بوو.

بە شافیعی گوت: چۆن فتوایەکی لەوشێوەیە بۆ گەنجێك دەردەکەیت؟!

شافیعیش بە زیرەکیەکەی خۆیەوە گوتی: ئەی باوکی محمد ئەوە پیاوێکی هاشمیە و لەم مانگەدا ژنی هێناوە، پرسیاری ئەوەی کرد کەئایا دەتوانێت دەستبازی و ماچ و موچ بکات و جیماع نەکات؟ هەربۆیە منیش ئەو فتوایەم بۆ دەرکرد.

[110] مناقب الشافعي للبيهقي ب ٢ لا ١٣٤ .

رەبیع دەڵێت سوێند بەخودا شوێنی ئەو گەنجە کەوتم و پرسیارم لەبارەی ژیانیەوە کرد، دەبینم بەتەواوەتی بەو شێوەیە کە شافیعی گوتی[111]!!

## شافیعی ئامۆژگاری ئەمیری ئیمانداران دەکات...

شافیعی قسەی دەکرد و گەوهەرو مرواری لەزارییەوە دەکەوتنە خوارەوە، هارونە ڕەشیدیش بە قسەکانی زۆر سەرسام بوو.

خەلیفە گوتی: ئەی کوڕی ئیدریس دڵت داگیرکردووم و لەبەرچاوم زۆر بەڕێزی، ئامۆژگارییەکم بکە کە ئەندازەی زانست و ڕاستیەتی تێگەیشتنی تۆی تێدا بزانم.

ئەوەبوو شافیعیش ئامۆژگارییەکی زۆر پاراوو بەهێزی کرد، تاوەکو هارونە ڕەشید گریا و شین و واوەیلای لێبەرز بوویەوەو فرمێسکەکانی ڕژان.

پیاوانی دەرباری ئەمیری ئیمانداران ئەوانەی کە لەدەوروبەرو پشتی سەریەوە وەستابوون بە شافیعیان گوت: بێدەنگبە کابرا، چاوەکانی ئەمیری ئیماندارانت خستە گریان.

شافیعیش بە توڕەییەوە و بە لۆمەوە سەیری کردن و بە دەنگێکی ڕاستگۆیانەوە گوتی: ئەی بەندەکانی بەرزی و یاریدەدەرانی تاریکی و بەردەستەکانی پێشەوایان کە خۆیان فرۆشتووە بە خۆشیەکانی دوونیای فانی و سزای هەتا هەتایی قیامەتیان کڕیوە، ئایا نەتان بینی ئەوانەی کە پێش ئێوە بوون کە چەندە زمانپاراوو خاوەنی نازو نیعمەت بوون، بەڵام دواتر خودا زۆر بەتوندی تۆڵەی لێکردوونەتەوە؟

دواتر بوونەتە دانیشتوانی کۆشك و تەلارو کەوتوونەتە ناو نازو نیعمەت و لەپاشان خراونەتە ناو گۆڕو تابوت و ژێر تاشە بەردەکانەوە!!

---

[111] حلية الاولياء ب ٩ ل ١٥٠ .

هاورەنە ڕەشید گوتی: ئایا پێویستیەکی تایبەت لەپاش گشتیەکان هەیە کە جێبەجێ بکرێت، یان پرسیارێك ماوە کە بکرێت؟

شافیعیش گوتی: ئایا فەرمانم پێدەکەیت کە لەپاش ئامۆژگاری و مەوعیزە ڕوی خۆم بە مەسەلە و داواکاری ڕەش بکەم[112] ؟!

## شارەزایی شافیعی...

لەناو گۆڕەپانی زانستدا شافیعی دانیشتبوو خەڵکیش لەدەوریدا بوون و سەبارەت بە نادروستی ئیمامەتی ژن بۆ پیاوان لە نوێژدا قسەو باسیان دەکرد.

گوتی: ئیمامەتی ژنان بۆ پیاوان دروست نیە لەبەر ئەم ئایەتی خوای گەورە کە دەفەرمێت: (پیاوان پلەو پایەیەکی زیاتریان بەسەر ژناندا هەیە)[113] سوننەتیش وایە کە لەڕیزەکاندا ژنان لە پشتی پیاوانەوە بن، دروست نیە کە پێشی پیاوان بکەون.

ئەگەر بڵێن: عەبد پلەی لە کەسی ئازاد کەمترە، خۆ دروستیشە کە ببێتە ئیمام بۆ کەسی ئازاد.

ئێمەش دەڵێین: عەبد دەتوانێت ئەم پلەیە بەدەستبهێنێت، ئەگەر ئازاد کرا دەبێتە کەسێکی ئازاد و کەموکورتیەکە نامێنێت، بەڵام ژن ناتوانێت ئەم کەموکورتیە لاببات، چوونکە ناتوانێت ببێتە پیاو[114].

---

[112] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ١٣٥ – ١٣٧ .

[113] سورەتی البقره ئایەتی ٢٢٨ .

[114] مناقب الشافعي للرازي لا ٢٥٣.

# شافیعی لە میوانی بیشردا....

لەناو تۆماری یادەوەرییەکاندا شافیعی بەسەرهاتەکانی خۆی لەگەڵ بیشری موریسیدا بۆ هاوەڵانی دەگێڕایەوە...

گوتی: کاتێك چووم بۆ بەغداد، چوومە ماڵی بیشری موریسیەوە، ئەوەبوو لەقاتی سەرەوەی ماڵەکەیدا نیشتەجێی کردم و خۆی لەخوارەوە بوو، ئەوەش لەبەر ڕێزی من، بۆ ماوەیەك لەلای مامەوە، ڕۆژێکیان دایکی پێی گوتم: باشە لەلای ئەم بێباوەڕە چی دەکەیت؟

(ئەوکات بیشر باوەڕی بە خەڵقی قورئان و کۆمەڵێك مەسەلەی کەلامی تر هەبوو).

ئەوەبوو لەلای ڕۆیشتم و وازم لێ هێنا[115].

# بەگەورەگرتنی شافیعی...

هارونە ڕەشید کەوتە قسە کردن لەگەڵ شافیعیدا و گوتی: ئەی محمدی کوڕی حەسەن لەبارەی مەسەلەیەکەوە پرسیاری لێبکە.

محمدیش گوتی: ئەی کوری ئیدریسی چی لەبارەی پیاوێکەوە دەڵێیت کە چوار ژنی هەیە یەکەمیان پور(خوشکی باوکی دووەمیانە)، سێیەمیشیان پور (خوشکی دایکی چوارەمیانە)؟

شافیعی گوتی: دووەم و چوارەمیان تەلاق دەدات.

محمدی کوڕی حەسەن گوتی: بەڵگەت چیە لەسەر ئەمە؟

[115] مناقب الشافعی للبیهقی ب ۱ لا ۲۲۹ .

شافیعیش گوتی: پێغەمبەری خودا (ص) فەرمویەتی: نابێت ژن و پورەکە(خوشکی باوکی) بەیەکەوە ژنی کەسێك بن و نابێت ژن و پورەکەی (خوشکی دایکی) بەیەکەوە ژنی کەسێك بن.

دواتر شافیعی گوتی: ئەی محمدی کوڕی حەسەن ئەی تۆ چی دەڵێیت لەبارەی ئەوەی کە ڕۆژی قوربانی (النحر) پێغەمبەر چۆن ڕوویکردە قیبلە و الله اکبری کرد؟

دەمی محمدی کوڕی حەسەن تەتەڵەی کرد و وەڵامی نەدایەوە، شافیعی ڕوویکردە خەلیفە هارونە ڕەشید و پێی گوت: ئەی ئەمیری ئیمانداران لەبارەی حەڵاڵ و حەرامەوە پرسیارم لێدەکات من وەڵامی دەدەمەوە، بەڵام لەبارەی سوننەتی پێغەمبەری خوداوە پرسیاری لێدەکەم دەمی تەتەڵە دەکات، خۆ ئەگەر پرسیارم لێبکردایە ئەبو حەنیفە چی کرد بەدڵنیاییەوە وەڵامی دەدامەوە!

هارونە ڕەشید زۆر سەرسام بوو بە شافیعی، ئاماژەی بۆ پێشکارەکەی کرد و محمدی کوڕی حەسەنی هەستاندەوە و شافیعی لە جێگەیدا دانیشاند و فەرمانیکرد کە پەنجا هەزار دیرهەمی پێبدەن و پێی گوت: هەمیشە دەبێت بێیت بۆلامان و سەردانمان بکەیت.

شافیعی هەستا و پارەکەی برد و لەناو خەڵکیدا هەمووی بەخشیەوە، هیچی نەبردەوە بۆ ماڵی خۆیان، بەوپەڕی ڕێزەوە چوویە دەرەوە، لەپاش ئەو ڕۆژە لەدەرباری خەلیفەدا ڕێزێکی زۆری لێدەگیراو بە گەورەیان دەگرت[١١٦] ....

## شافیعی و فەقیهەکەی خوراسان...

شافیعی لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا دانیشتبوو، بەدەنگێکی ناسك و بەزمانێکی پاراوەوە حەدیسی پێغەمبەری خودای بۆ دەگێڕانەوە، کە فەرمویەتی

---

[١١٦] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ١٣٧ _ ١٣٨ .

(ئايا عوقەیل لە مەککەدا ماڵێکی بۆ ئێمە هێشتووەتەوە؟!)باسی خاوەندارییەتی ماڵەکانی مەککەی دەکرد.

ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمیش وەلامیدایەوە و گوتی: بەلام عەتاو تاووس و ئیبراهیم و حەسەن ئەم ڕایەیان نیە.

شافیعیش بەتوڕەییەوە گوتی: ئەوە کێیە؟

گوتیان: ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی حەنزەلییە.

شافیعی گوتی: تۆی کە خەڵکی خوراسان وادەزانن کە شارەزاو فەقیهی ئەوانی؟

ئیسحاقیش گوتی: بەڵێ وادەزانن.

شافیعیش بە دڵتەنگیەوە گوتی: خۆزگایە کەسێکیتر بوایە لە شوێنی تۆدا، بۆ ئەوەی هەردوو گوێم ڕابکێشایە، من دەڵێم پێغەمبەری خودا دەفەرمێت، تۆیش دەڵێیت: عەتاو تاووس و ئیبراهیم و حەسەن لەگەڵ ئەو ڕایەدا نین!!

با ئەوانە هەر لەسەر ئەو ڕایە نەبن، باشە قسەی پێغەمبەری خودا پێویستی بە بەڵگە هەیە؟!

## شافیعی سێجار موفلیس دەبێت...

بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە عەمری کوڕی سەواد دانیشتبوو سەرقاڵی گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی شەیخ و مامۆستای خۆی ئیمامی شافیعی بوو بۆ ئەوەی قوتابیانی زانست سود و پەند و ئامۆژگاری لێوەربگرن.

عەمری کوڕی سەواد دەڵێت: شافیعی دەست و دڵئاواترینی خەڵکی بووە لە بەخشینی دینارو دیرهەم و پێخۆردا.

شافیعی خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: سێجار لەژیانمدا موفلیس و بێپارە بووم، دارو نەدارم فرۆشتووە تەنانەت خشڵ و زێڕەکانی ژن و کچەکەیشم لەبەر نەداری لەبازاڕدا هەڕاج کردووە، بەڵام لەژیانمدا هیچکاتێك ڕەهنم نەکردووە[117].

## قورئان کەلامی خودایە...

شافیعی لەسەر عەرشی زانست دانیشتبوو، ناوبانگیشی لەمەدا وەك دەهۆڵ وابوو لەناو گوێکاندا، پیاوێکی نەشارەزا لە خەزینەکانی ئیمان و باوەڕ موجادەلەی لەگەڵدا دەکرد:

گوتی: باسی قورئانم بۆ بکە ئایا خالیقە؟

شافیعی گوتی: پەنا دەگرم بەخودا نەخێر.

پیاوەکەیش گوتی: دەی کەوابوو مەخلوقە.

شافیعیش گوتی: پەنا دەگرم بەخودا نەخێر.

پیاوەکە گوتی: دەی کەوابوو مەخلوقیش نیە.

شافیعی گوتی: بەخودا بەڵێ.

پیاوەکە گوتی: باشە بەڵگەت چیە لەسەر ئەوەی کە مەخلوق نیە؟

شافیعی سەری بەرز کردەوە گوتی: دانبەوەدا دەنێیت کە قورئان کەلامی خودایە؟

پیاوەکە گوتی: بەڵێ.

شافیعی گوتی: کەواتە دانیشدەنێیت بەوەدا کە خودا هەبووە، کەلامەکەیشی هەبووە، یان خودا هەبووە و دواتر کەلامەکەی هێناوەتە بوونەوە؟

پیاوەکەیش گوتی: باوەڕم وایە کە خودا هەبووە و کەلامەکەیشی هەر هەبووە.

---

[117] حلية الاولياء ب ٩ لا ١٣٢ .

شافیعیش بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: ئەی خەڵکی کوفە کاتێك ئێوە باوەڕتان بەوە هەیە کە پێش ئەوەی هەرشتێك دروستبکات خۆی هەبووە، کەلامەکەیشی هەر ئەزەلییەو هەبووە، کەواتە کەلامەکەیشی هەر خودایە، یان بەدەربێت لەخودا یان بێجگە لە خودا بێت؟

پیاوەکە زانی کە کەلامی خودا بەشێکە لە زات و خودی ئەو، هەروەك چۆن خودای گەورە مەخلوق نیە، هەروەها کەلامەکەیشی مەخلوق نیە، پیاوەکە بێدەنگبوو هەستاو ڕۆیشت[111].

## هونەری مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکیدا....

بەوپەڕی ویقارو هێمنی و دڵنیاییەوە یونسی کوڕی عەبد ئەعلا دانیشت و دڵ و دەروونی بە نوری زانستی شافیعی ڕووناکدەکردەوە، هەست و شعورو نەستەکانی بە فیقهو تێگەیشتنەکانی تێر دەکرد.

ڕۆژێکیان شافیعی کە فێری هونەری مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکدا دەکرد پێی گوت: ئەی یونس ڕەقی و زبربوون لەگەڵ خەڵکیدا دەبێتە هۆی دوژمنایەتی، کرانەوەیش لەگەڵیاندا دڵی کەسانی خراپیشت بەرامبەر نەرمدەبێت و زیانیان کەمدەبێتەوە بەرامبەرت، هەربۆیە تۆیش با هەڵسووکەوتەکانت لەنێوان زبری و نەرمی نیانیدا بجوڵێتەوە[112].

---

[111] مناقب الشافعي للبيهقي ج ١ ل ٤٠١ - ٤٠٨.

[112] حلية الأولياء ج ٩ ل ١١١.

## شافیعی هاوەڵەکانی پەروەردە دەکات...

بە خۆشکێنی و ملکەچیەوە، ڕەبیعی کوڕی سولەیمان لەبەردەم ئیمامی شافیعی شەیخ و مامۆستایدا دانیشت.

شافیعیش هەم وەك پەروەردەکارو هەم وەك مامۆستایش کە حیکمەت و دانایی و ئەزمونی ڕۆژانی لەبەر کردبوو گوتی: ئەی ڕەبیع شتێك کە پەیوەندی بە تۆوە نیە قسەی لەسەر مەکە، چوونکە ئەگەر قسەیەك بکەیت کە پەیوەندی بەتۆوە نەبێت، لەبری ئەوەی کە تۆ خاوەنی قسەکە بیت ئەو دەبێتە خاوەنی تۆ دەبێت هەموو دەرئەنجامە باش و خراپەکانی هەڵبگریت[120].

## شافیعی و دوونیا....

ئیمامی شافیعی بەبێ ئەوەی کە لاواز بێت هەمیشە دار عاسایەکی دەگرت بەدەستیەوە.

موزەنی پێی دەگوت: باشە بۆچی عاسا و گۆچان دەگریت بەدەستەوە و جەستەیشت لاواز نیە؟

شافیعی گوتی: بۆ ئەوەی ئەوە وەبیری خۆم بهێنمەوە کە لەم دوونیایەدا سەفەریم[121].

ڕۆژێکیان شافیعی لەلا هاوەڵانیدا دانیشتبوو باسی داماوی حاڵی خۆی بۆ دەکردن لەگەڵ دوونیادا.

گوتی: هەرگیز لەدەست هەژاری ڕزگارم نەبووە، هەندێك لە ژیانم تێپەڕی کە هەویرو تەڕو نانی ووشکم بەئاوەوە خواردووە[122].

---

[120] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٧٢ .

[121] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ ١٧٠ .

## شافیعی زو نانی بەیانی دەخوارد....

ڕۆژێکیان ئیمامی شافیعی چوو بۆلای خەلیفە هارونە ڕەشید.

خەلیفە هارونە ڕەشید گوتی: ئەی محمد بیستومە کە نانی بەیانی زوو دەخۆیت؟

شافیعی گوتی: بەڵێ ئەی ئەمیری ئیمانداران.

هارونە ڕەشیدیش گوتی: باشە بۆچی؟

شافیعی گوتی: ئاو زۆر سارد نیە، هەوا پاکە، مێش کەمە، هەم خۆیشم لەوە دەپارێزم کە خەڵکی بێن بە سەرمدا و بەشی ئەوانم نەبێت و خەجاڵەت ببم"[123].

## لێرەدا شافیعی پێکەنی....

پیاوێك هات بۆلای ئیمامی شافیعی و پێی گوت: فلانەکەس دەڵێت: شافیعی فەقیهو شارەزا نیە، شافیعیش پێکەنی و گوتی:

*من پێکەنیشتم و ئەوانەی کە ئیرەیم پێ دەبەن*

*ئەی خودای گەورە لەبەر ژمارەیان من سەرشۆڕ نەکەیت"[124]*

## خۆشەویستی شافیعی بۆ زانست و زانیاری....

پێش خۆرهەڵاتن پیاوێك چو بۆلای شافیعی و دەبینێت سەیری قورئان دەکات.

بە سەرسامیەوە پێی گوت: ئەی ئەبو عبدالله لەم کاتەیشدا قورئان دەخوێنیت؟

---

[122] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٦٩ .

[123] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ١٢٢ .

[124] مناقب الشافعی للبیهقی ب ٢ لا ٧٤ .

شافیعی بەوپەڕی دڵخۆشیەوە گوتی: هەر کە نوێژی عیشام کردووە دەستم کردووە بە خوێندنەوەی قورئان و سەیری حوکمەکانی قورئانم دەکرد[125].

## شافیعی بەرگری لە خۆی دەکات...

پیاوێك چوو بۆلای ئیمامی شافیعی، لەوکاتەدا لەسەر پشت ڕاکشابوو.

ئەیویست تۆڵەی لێبکاتەوە گوتی: هاوەڵانی ئەبوحەنیفە ڕەوانبێژترو زمانپاراوترن.

شافیعیش هەستایەوە و دانیشت و بەم شیعرە بەرگری لە خۆی کرد و گوتی:

***ئەگەر شیعر بۆ زانایان باش بوایە***

***ئەوا من ئەمڕۆ لە لەبید شاعیر تر بووم***

***لەشەڕیشدا لە هەموو شێرێك ئازاتر بووم***

***لە ئالی موهەلەب و ئالی یەزیدیش بوێرتربووم***

***ئەگەر ترسی خودای ڕەحمانم نەبوایە***

***ئەوا هەموو خەڵکیم دەکردە بەندە و خزمەتکاری خۆم***[126].

## شافیعی و داوەتی خەڵکی...

ڕۆژێکیان شافیعی خواردنێکی زۆری دروستکرد و خەڵکی داوەت کرد، کاتێك خەڵکەکە نانیان خوارد، بوەیتی بە ڕەبیعی کوڕی سولەیمانی هاوڕیی گوت: دانیشە و تۆیش نان بخۆ.

ڕەبیعیش بەشەرمێکەوە گوتی: کێ مۆڵەتی پێداوین کە بخۆین؟

---

[125] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ٢٤٤ .

[126] مناقب الشافعی للرازی لا ١١٩ .

شافیعیش ئەم قسەیەی بیست، بەسەرسوڕمانەوە گوتی: پاکوبێگەردی بۆ خودا پەروەردگار بێ برام هەموو ماڵ و سامانی من بۆ تۆ حەڵاڵ و ڕەوایە[127].

## شافیعی و کابرای بیدعەچی...

یونسی کوڕی عەبد ئەعلا لەلای شافیعی دانیشت و گوتی: لەیسی کوڕی سەعدی هاوڕێمان دەڵێت: ئەگەر کەسێکی بیدعەچی ببینم بەسەرئاودا بڕوات هەرگیز قبوڵم نیە و باوەڕی پێناکەم.

شافیعیش گوتی: ئەگەر قەیصەریش بێت و بەسەر ئاویشدا بڕوات باوەڕی پێناکەم.

ڕۆژێکیان حەفصی فەرد کە بیدعەچیەك بوو باوەڕی بە خەڵقی قورئان هەبوو، هات بۆلای ئیمامی شافیعی و قسەی لەگەڵدا کرد، دواتر شافیعی چووبۆلای هاوەڵانی و بە ئیمانێکی بەهێزەوە گوتی: ئەگەر بەندە بە کۆڵێك گوناهەوە کە هێندەی شاخەکانی توهامە بێ بچێتەوە بەردەم بارەگای خودا، زۆر باشترە تاوەکو بە باوەڕێکی لارو لەوێرەوە بگاتەوە بە خودای خۆی وەك ئەم پیاوە و هاوەڵەکانی[128]....

## ئەگەر قسەیەك ڕاستبێت ئەوە مەزهەبی منە...

بەڕێزو خۆشکێنیەکەوە ئیمامی شافیعی لەنێوان فوتابیەکانیدا دانیشت و ئەوانیش بەجوانی گوێیان بۆ قسەکانی گرتبوو.

---

[127] توالی التأسیس لا ١٢٤ .

[128] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ٤٥٣ ـ ٤٥٤ .

بەوپەڕی گەورەگرتنی فەرموودەکانی خوداوە گوتی: هەر مەسەلەیەك کە من قسەم تێدا کردبێت، بەلاّم حەدیسی پێغەمبەری خودای بەپێچەوانەیەوە هاتبێت ئەوا لەژیانی خۆم و لەپاش مردنیشم حەزدەکەم پێداچوونەوەی تێدا بکرێت و ڕەتبکرێتەوە.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: جوانترین کاری شافیعی ئەوەبوو کاتێك کە دیسێکی ببیستایەو شارەزایی لەبارەیەوە نەبوایە هیچکات قسەی لەسەر نەدەکردو وازی لێدەهێناو نەیدەگێڕایەوە[129].

## شافیعی و حەدیسی ئاحاد...

ماڵی شافیعی لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی لێوانلێو بوو لە قوتابیانی زانست تاوەکو بەتەواوەتی ماڵەوەیان بێزار بوبون.

شافیعی چوو بۆلای پیاوێك ناوی ئیبراهیمی کوڕی عولییە بوو کە کەسێکی بیدعەچی بوو، باسی حەدیسی ئاحادی بۆ دەکرد.

حاریسی کوڕی سەریحیش گوتی: ئەی باوکی عبدالله خەڵکی ڕوی تێکردویت و تۆیش ڕووتکردووەتە ئەم کەسە بیدعە چیەو قسەی لەگەڵدا دەکەیت؟!

شافیعیش بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: قسەکردنی من بۆ ئەم کەسە بە ئامادەبوونی قوتابیەکانم زۆر باشترە بۆیان لەوەی کە بەتایبەت قسەیان بۆ بکەم.

گوتی: ڕاستدەکەیت.

دواتر دەریای زانست محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی ڕوویکردە ئیبن عولەییەو گوتی: ئایا تۆ وادەزانی کۆدەنگی (الاجماع) بەلگەیە؟

گوتی: بەڵێ.

---

[129] توالی التأسیس لا ١٠٨ .

شافیعیش گوتی: ئایا حەدیسێکی ئاحاد کە دادپەروەرێك گێڕاویەتیەوە بە کۆی دەنگ وەری دەگریت یان بە بێ کۆدەنگی و ئیجماعی زانایان؟

ئیبن عولوییو نەیتوانی بە تاکە یەك ووشەیش وەلامبداتەوە، چوونکە حەدیسی ئاحاد بە ئیجماع و کۆدەنگی زانایان سەلمێنراوە، هاوەلانی حەدیسیش زۆر دلخۆشبوون بەوەی کە شافیعی زالبوو بەسەریدا[130].

## شافیعی حوسەین و ئەبوسەور دەبەزێنێت...

شافیعی زۆر بلیمەت و شارەزابوو، هەموو مەسەلەکانی لەسەر تابلۆی دلی تۆمار دەکرد و دەینەخشاندن، مونازەرەی لەگەل هەرکەسێکدا کردبێت زالبووە بەسەریدا.

کاتێك شافیعی هاتە عێراقەوە کە قەلای قوتابخانەی بۆچوون (مدرسة الرأی) بوو حوسەینی کەرابیسی کە یەکێك لە قوتابیانی ئەو قوتابخانەیە بوو بەخێرایی چوو بۆلای ئەبو سەوری هاوڕێی.

بە سوکایەتی و گالتەپێکردنێکەوە گوتی: پیاوێك هاتووە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە یەکێك لەهاوەلانی قوتابخانەی حەدیسە، وەرە بابچین و کەمێك گالتەی پێبکەین!

بەخێراییەوە ڕۆیشتن تاوەکو گەیشتنە لای شافیعی، حوسەین دەستیکردە پرسیارکردن و بۆ ئەوەی شافیعی بێزار بکەن پرسیار بارانی کرد، محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی شێری ئازای زانست و زانیاری و بیری تیژ یەك لەدوای یەك وەلامی هەموو پرسیارەکانی دەدایەوە.

---

[130] مناقب الشافعی للبیهقی ب ١ لا ٢١١ – ٢١٢ .

دەیگوت: خودای گەورە فەرمویەتی، پێغەمبەر فەرمویەتی، تاوەکو حوسەینی کەرابیسی و ئەبو سەور بێدەنگبوون و باوەڕیان بە زۆری و فراوانی زانست و زانیاری شافیعی هێناو بوونە قوتابی ئەوو شوێنی کەوتن[131].

## شافیعی و خومچییەکە....

شافیعی قۆڵی جیدیەتی لێهەڵماڵی و بڕیاریدا لە شاری مەککە دەربچێت، جلوبەرگێکی بەغدادی گرانبەهای دایە خومچییەك کە بۆی ڕەنگبکات، بەڵام دووکانی کابرای خومچی ئاگری تێبەربوو، جلوبەرگەکانی شافیعیش سوتان.

پیاوە خومچییەکە لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکیدا بەخێراییەوە چوون بۆلای شافیعی و بۆ ئەوەی تکای لێبکەن کە پارەی جلوبەرگە سوتاوەکان کە بڕیارە دوکاندارەکە بیدات بە شافیعی کەمێك دوای بخات.

شافیعی بە ئەدەبی زانای خاوەن وەرعەوە گوتی: زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر پارەی ئەم جلە سوتاوانە کە چەند بێت و چۆن بێت، منیش پێموانیە کە ئەرك بێت لەسەر تۆ کە نرخی ئەم جلوبەرگە سوتاوانە بدەیت، ئەگەر واجیب بێت تۆ بیدەیت دڵنیابە من هەرگیز ئەو پارەیە لەتۆ وەرناگرم و بڕۆ گەردنت ئازاد بێت[132].

## شافیعی و عاقیبەت خێری...

شافیعی کەوتە سەر جێگەی مەرگ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و موزەنی هاتن بۆ سەردانی.

گوتیان: ئێستە چۆنی ئەی باوکی عبدالله؟

---

[131] مناقب الشافعي للبيهقي ب ١ لا ٢٢١ .

[132] حلية الاولياء ب ٩ لا ١٢٦ .

شافیعیش بە دەنگێکی لاوازی ماندوەوە گوتی: براکانم من لە دونیادا بوومەتە سەفەری و دەڕۆم، براکانم بەجێدەهێڵم، شەرابی مردن دەنۆشم، دەگەمەوە بە کارو کردەوە خراپەکانم و دەچمەوە بەردەم بارەگای خودا، ئیتر نازانم ئایا ڕۆحم بۆ بەهەشت دەچێت تاوەکو پیرۆزبایی لێبکەم یان بۆ ئاگری دۆزەخ دەچێت تاوەکو سەرەخۆشی لێبکەم. دواتر گریاو بەدەنگێکی نزمەوە ئەم شیعرانەی گوت:

*کاتێك دڵم ڕەقبوو ڕێگەکانم لێگیران*

*ئومێدم بە بەخشندەیی تۆ کردە پەیژەیەك بۆ خۆم*

*گوناهەکانم زۆرن و کاتێك بەراوردم کردن*

*بە لێبوردەیی تۆ دەبینم لێبوردەیی تۆ زۆر گەورەترە*

*ئەگەر ویستی تۆی لەسەر نەبێت هیچ زانایەك بە شەیتان هەڵناخەڵەتێت*

*ویستی تۆی خالیقی لەسەر بوو هەربۆیە شەیتان ئادەمی هەڵبژاردەی تۆی فریودا*

دەستیکردە گریان و ئەوانەی دەوروبەریشی هەموویان گریان، سەیری کردن و گوتی: ماڵئاوا ماڵئاو هاوڕێکانم، دابڕان دابڕان خۆشەویستانم، دواتر ڕوویکردە قیبلە و شایەتمانی هێناو ڕۆحی بەرەو لای خودای خۆی گەڕایەوە[١٣٣].

## خودا چی لێکردویت.....؟

بە خەمو پەژارەیەکی زۆرەوە سولەیمانی کوڕی ڕەبیع لەلای هاوەڵانی دانیشت و ئەو خەوەی بۆ دەگێڕانەوە کە بە ئیمامی شافیعیەوە بینیبوی.

گوتی: لەپاش مردنی لە خەومدا شافیعیم بینی.

[١٣٣] طبقات الشافعية للسبكي ب ١ لا ١٨٨ .

گوتم: ئەی باوكی عبدالله خودای چی لێكردویت....؟

شافیعی گوتی: لەسەر كورسییەكی ئاڵتون داینیشاندم و گەوهەری تەڕو تازەی بەسەردا دەپرژاندم و....والسلام[134].

# مانگی ئەم كۆڕە لەكوێیە...؟

بە چەپكێك لە بۆنی خۆش و میسك و گولاڵەوە، ڕۆحەكەی شافیعی گەڕایەوە بۆلای خودای خۆی، قوتابیان و زانستخوازان لەپاش مردنی ئەو زانایە زۆر بەكەمی دەهاتن بۆ ناو كۆڕو مەجلیسی وانەكانی.

عەرەبێكی دەشتكی هاتو سڵاوی لە قوتابیەكانیكرد و گوتی: مانگ و خۆری ئەم كۆڕو مەجلیسە لەكوێیە؟!

گوتیان: كۆچی دواییكرد ڕەحمەتی خودای لیبێت.

پیاوەكە زۆر گریا، دواتر لەوكاتەی كە فرمێسك بەسەر كولمەكانیدا دەهاتنە خوارەوە گوتی: ڕەحمەتی خودای لێبێت و خودا لێی خۆش بێت، چوونكە ئەو زانایە بە قسەكانی بەڵگە ئاڵۆزەكانی دەكردەوە، بە بەڵگەی ڕوون و ئاشكرا بەرامبەرەكانی دەمكوت دەكرد، پەڵەی ناشیرینی بەسەر دەمووچاوە ڕەشەكانەوە پاكدەكردەوە، بە بیرو بۆچوونەكانی خۆی دەرگا داخراوەكانی دەكردەوە، دواتر بە هەنگاوانێكی هێمنەوە و بەدڵێكی زۆر تەنگەوە بۆ كۆچی دوایی شافیعی هەستاو كۆڕەكەی بەجێهێشت[135]....

***

[134] صفة الصفوة ب ٢ ٪ ٤٦٩ .

[135] صفة الصفوة ب ٢ ٪ ٤٦٩ .

